
شیکردنەوەی عەقیدەی
ئیمامی سفیانی ثەوری
نووسینی
مامۆستا ئوسامە تەوحیدی
(شارەزووری)
١٤٤٦هـ

# پێرستی بابەتەکان



**الحمد لله رب العالمين**، وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين. أما بعد :

به یارمەت ـی الله دەستدەکەین بە پوختە شەرحێ بـۆ عەقیدەکەی ئیمام سوفیان ـی ثەوری

ئەم زانا بەڕێزە ناوی سفیان ـی کوڕی سعید ـی کوڕی مسروق الثوري یە یەکێکە لە پێشەوایانی سەلەف وپێشەوا بووە لە عەقیدە لە شاری کوفـە وە ئیمامێکی گەورەی ئەهلی سونەت و ئەثەرە وە زانایان کۆڕا یەکدەنگن لەسەر ئیمـامەتی ئەم زانا بەڕێزە ئیمام بووە لە سونەت ولە فیقهـ و وزوهد وشوێنکەوتن بۆ سوننەت.

زیاد لەیەکێ لە زاناکان سوفیانی ثەوری ناوبردووە بە ئەمیری باوەڕدان لە فەرموودە ئەم زانا بەڕێزە لە کوفە ژیاوە سەرەڕای ئەوەی کوفە موخالەفاتیان هەبووە بۆ سونەت بەڵام ئەم زانایە پارێزراوبوە لەو موخالەفاتانە ودەستگرتوو بووە بە سوننەت وە ئەم نوسراوە عەقیدەیە کەبەعەقیدەی سفیان ثەوری ناسراوە لەبەرئەوەیە لە سوفیانەوە گێڕاوەتەوە ئەگینا عەقیدەی هەموو زانایان ـی سەلەف یەکـ عەقیدەیە وە زانستی عەقیدە هەندێ لە زانایان بە زانست ـی عەقیدە ناوی دەبەن وهەندێ تر ناوی ئەنێن ئصولی دین یان سونەت یان شەریعەت یان ئصولە گشتیەکان ـی دین ئەم ناوانە هەمووی بۆبابەتە عەقیدەیەکان بەکار هاتووە ومەبەستیش لێی ڕوونکردنەوەی بابەتەکانی بیروباوەڕ وتەوحیدە .

# مەتنەکە

سَمِعْتُ شُعَيْبَ بْنَ حَرْبٍ يَقُولُ: «قُلْتُ لِأَبِي عَبْدِ اللَّهِ سُفْيَانَ بْنِ سَعِيدٍ الثَّوْرِيِّ: " حَدِّثْنِي بِحَدِيثٍ مِنَ السُّنَّةِ يَنْفَعُنِي اللّه عَزَّ وَجَلَّ بِهِ، فَإِذَا وَقَفْتُ بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى وَسَأَلَنِي عَنْهُ فَقَالَ لِي مِنْ أَيْنَ أَخَذْتَ هَذَا ؟» قُلْتُ: «يَا رَبُّ حَدَّثَنِي بِهَذا الْحَدِيثِ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَأَخَذْتُهُ عَنْهُ فَأَنْجُو أَنَا وَتُؤَاخَذُ أَنْتَ» . فَقَالَ: " يَا شُعَيْبُ هَذا تَوكِيدٌ وَأَيُّ تَوكيد اكتب :

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الْقُرْآنُ كَلَامُ اللَّهِ غَيْرُ مَخْلُوقٍ، مِنْهُ بَدَأَ وَإِلَيْهِ يَعُودُ ، مَنْ قَالَ غَيْرَ هَذَا فَهُوَ كَافِرٌ ، وَالْإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ وَنِيَّةٌ ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ ، يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ، وَلَا يَجُوزُ الْقَوْلُ إِلَّا بِالْعَمَلِ، وَلَا يَجُوزُ الْقَوْلُ وَالْعَمَلُ إِلَّا بِالنِّيَّةِ، وَلَا يَجُوزُ الْقَوْلُ وَالْعَمَلُ وَالنِّيَّةُ إِلَّا بِمُوَافَقَة السُّنَّة.

قَالَ شُعَيْبٌ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا عَبْد اللّهِ وَمَا مُوَافَقَةُ السُّنَّةِ؟ قَالَ : تَقْدِمَةُ الشَّيْخَيْنِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَا شُعَيْبُ لَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتَ حَتَّى تُقَدِّمَ عُثْمَانَ وَعَلِيًّا عَلَى مَنْ بَعْدَهُمَا ، يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ لَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتُ لَكَ حَتَّى لَا تَشْهَدَ لِأَحَدٍ بِجَنَّةٍ وَلَا نَارٍ إِلَّا لِلْعَشَرَةِ الَّذِينَ شَهِدَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ وَكُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ.

يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ لَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتُ لَكَ حَتَّى تَرَى الْمَسْحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ دُونَ خَلْعِهِمَا أَعْدَلَ عندَكَ مِنْ غَسْل قَدَمَيْكَ ، يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ وَلَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتَ حَتَّى يَكُونَ إِخْفَاءُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ فِي الصَّلَاةِ أَفْضَلَ عِنْدَكَ مِنْ أَنْ تَجْهَرَ بِهِمَا ، يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ لَا يَنْفَعُكَ الَّذِي كَتَبْتَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ وَحُلْوِهِ وَمُرِّهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ، يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ وَاللَّهِ مَا قَالَتِ الْقَدَرِيَّةُ مَا قَالَ اللّهُ، وَلَا مَا قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ

، وَلَا مَا قَالَ النَّبِيُّونَ، وَلَا مَا قَالَ أَهْلُ الْجَنَّةِ، وَلَا مَا قَالَ أَهْلُ النَّارِ، وَلَا مَا قَالَ أَخُوهُمْ إِبْلِيسُ لعنه الله ، قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ:

﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ [الجَاثِيَة : ٢٣]

وَقَالَ تَعَالَى: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ [التَّكْوِير : ٢٩] ، وَقَالَتِ الْمَلَائِكَةُ: ﴿ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ [البَقَرَة : ٣٢] ، وَقَالَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿ إِنْ هِيَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِي مَن تَشَآءُ ﴾ [الأَعْرَاف : ١٥٥] ، وَقَالَ نُوحٌ عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾[هُود : ٣٤] ، وَقَالَ شُعَيْبٌ عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ [الأَعْرَاف : ٨٩] ، وَقَالَ أَهْلُ الْجَنَّةِ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾ [الأَعْرَاف : ٤٣] ، وَقَالَ أَهْلُ النَّارِ: ﴿ غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴾ [المُؤْمِنُون : ١٠٦] ، وَقَالَ أخوهم إِبْلِيسَ لَعَنَهُ اللّٰهُ: ﴿ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي ﴾ [الحِجْر : ٣٩] .

يَا شُعَيْبُ لَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتَ حَتَّى تَرَى الصَّلَاةَ خَلْفَ كُلِّ بَرٍّ وَفَاجِرٍ، وَالْجِهَادَ مَاضِيًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَالصَّبْرَ تَحْتَ لِوَاءِ السُّلْطَانِ جَارَ أَمْ عَدَلَ.

قَالَ شُعَيْبٌ: فَقُلْتُ " لسُفْيَانَ: يَا أَبَا عَبْدِ اللّٰهِ: «الصَّلَاةُ كُلُّهَا ؟» قَالَ: " لَا وَلَكِنْ صَلَاةُ الْجُمُعَةِ وَالْعِيدَيْنِ، صَلِّ خَلْفَ مَنْ أَدْرَكْتَ، وَأَمَّا سَائِرُ ذَلِكَ فَأَنْتَ مُخَيَّرٌ، لَا تُصَلِّ إِلَّا

**خَلْفَ مَنْ تَثِقُ بِهِ، وَتَعْلَمُ أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ، يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ إِذَا وَقَفْتَ بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَسَأَلَكَ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ فَقُلْ: يَا رَبِّ حَدَّثَنِي بِهَذَا الْحَدِيثِ سُفْيَانُ بْنُ سَعِيدٍ الثَّوْرِيُّ « ثُمَّ خَلِّ بَيْنِي وَبَيْنَ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ » .**

---

نووسـەر رحمه الله ـدەفەرمووێت [ **سمعت شعيب بن حرب يقول: قلت لأبي عبد الله سفيان بن سعيد الثوري: حدثني بحديث من السنة ينفعني الله عز وجل به، فإذا وقفت بين يدي الله تبارك وتعالى وسألني عنه، فقال لي: من أين أخذت هذا؟ قلت: يا رب! حدثني بهذا الحديث سفيان الثوري، وأخذته عنه، فأنجو أنا، وتؤخذ أنت** ]

بیستم لە شعیب ـی کوڕی حرب ئەیگووت وتم بە باوکی عبداللە سوفیان ـی ثەوری شتێکم لە سونەت پێ بڵێ تاوەکـ اللە تعالی سودمەند بکات لێی وە ئەگەر لە ڕۆژی قیامـەت وەستـام لە بەرامبـەر اللە تعـالی ئەگـەر لێی پرسیم ئـەم عەقیـدەت لە کوێ وەرگرت بڵێم پەروەردگارم ئەم عەقیدەیە سوفیان ـی ثەوری پێی وتم ولە سوفیان وەرمگرت تا من ڕزگارم بێت و لێپرسینەوە لەگەڵ تۆ بکرێت .

( شعيب بن حرب ) أبو صالح المدائني ـیە ویەکێکە لە پێشەوایانی ڕیوایەت وە ڕیوایەتی گێڕاوەتەوە لە پێشەوایان وەکـ سفيان الثوري و شعبة بن الحجاج و زهير بن معاوية

وە ئیمام ـی سفیان لەساڵی 97 ـی هیجری لەدایكبووە ولە لەساڵی 161 ـی هیجری وەفات ـی كردووە ، وە ئیمام ـی سفیان لە هەندێ بابەت كاریگەر بووە بە ئەهلی ڕەئی وچاوی لە ابو حنیفە كردووە ، أبو یوسف ـدەڵێت ( **إن سفيان الثوري يقلد أبا حنيفة أكثر مني** ) سوفیان ـی ثەوری لە من زیاتر چاو لە ابو حنیفە دەكات .

**شعیب بن حرب كە پرسیار لە سفیان الثوري دەكات ئەو ئاماژەیەی تێدایە** كە پێویستە مرۆڤ پرسیار بكات لە كەسێ كە دڵنیابێت ئەو كەسە خاوەن زانستە نەوەكـ پرسیار لە ئەهلی جەهل ونەفام بكات هەر بۆیە شعیب بن حرب كە هات پرسیار دەكات پرسیار لە سوفیان دەكات چونكە دەزانێت سوفیان ئیمام وزانایە بە سوننەت .

شعیب ـدەفەرمووێت ( **حدثني بحديث من السنة** ) سوننەت لێرە مەبەست پێی قورئان وسوننەتە واتە شتێكم پێ بڵێ قسەی خۆت نەبێت بەڵكو وەرگیراوبێت لە شەرع لە كتاب ولە سوننەت ئەمەش بەڵگەی ئەوەی تێدایە كەسـی پرسیاركەر داوای بەڵگە بكات لە كەسی فەتوادەر ، وە لەسەر كەسی زاناش پێویستە توڕە نەبێت كاتێ داوای بەڵگەی لێدەكرێت بۆ ئەوەی حوجەكەی بە جوانی بچەسپێت ، چونكە سونەت و قورئان وەحی اللّه تعالی ـن وە پێغەمبەر ﷺ هەرشتێكی فەرمووبێت ئەوە بە وەحی اللّه تعالی فەرموویەتی

اللّه تعالی ـدەفەرمووێت ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴾ [النَّجم : ٣ - ٤]
واتا : پێغەمبەر ﷺ كەسێكـ نییە لە خۆیەوە قسە بكات بەڵكو هەرشتێ ئەڵێت ئەوە وەحیە وبۆی ڕەوانە دەكرێت لەلایەن اللّه تعالی ـوە .

وە هەموو ئومەت كۆڕان لەسەر ئەوەی قسەی پێغەمبەر ﷺ وەحیە لە لایەن اللّه تعالی ـوە واتە ئەو قسانەی پێغەمبەر كە لەبارەی دینەوەیە لەبارەی فەرمانكردن و نەهیكردنەوەیە ، بەڵام قسەی پێغەمبەر ﷺ بۆ جگە لە بابەتی دین ئەوە پێی

ناوترێ وەحی بۆنموونە وەکـ بانگکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەریەکێ لە خێزانەکانی نموونە کە دەیفەرموو یا عائیشه ئەمە پێی ناوترێ وەحی بە ئیجمــاع

ئیمام ـی الأوزاعي رحمه الله ـدەیفەرموو :

( **إن جبريل نزل على رسول الله ﷺ بالسنة كما نزل عليه بالقرآن** )

جبریل بە سوننەتەوە دابەزیوە بۆسەر پێغەمبەر ﷺ هەروەکـ چۆن بە قورئان دابەزی بۆ پێغەمبەر ﷺ ، کەواتـا سوننەت ـی پێغەمبەر ﷺ لە وەحی اللّه تعالی یە.

## ئایا کردارەکانی پێغەمبەر ﷺ هەمووی دینە ؟

کردارەکانی پێغەمبەر ﷺ دابەش دەکرێت بۆ سێ بەش

بەشـی یەکەم / کردارە پەرستشەکان ـی پێغەمبەرە ﷺ واتە ئەسڵ لە کارەکان ـی پێغەمبەر ﷺ عیبادەتە ئیلا بەڵگەیەکـ هاتبێت بیسەلمێنێت ئەو کـارەی پێغەمـبەر ﷺ لە بابەتە دینیەکان نییە.

بەشـی دووەم / کردارە نەریتییەکان ـی پێغەمبەر ﷺ واتە ئەو کارانەی کەنەریتی ئەو کۆمەڵگا وشوێنیە وخەڵکـ تێیدا هاوبەشن وهیچ بەڵگەیەکـ لە قورئان وسوننەت نەهاتووە ئەوکارە بکات بەدین  نمونەی جلەکان ـی پێغەمبەر ﷺ وپاڵتاو لەبەرکردن کە ئەم شتانە پێغەمبەر ﷺ ئەیپۆشی لەهەمان کاتدا کافران قوڕەیشیش ئەیانپۆشی بۆیە بەم کردارانە ناوترێ دین بەڵکو عادەتە ( نەریت ).

بەشـی سێهەم / کرداره خوویەکانی مرۆڤ ( سروشتی مرۆڤەکە ) واتە هەر مرۆڤێ طەبع و سروشتێکی تایبەت بەخۆی هەیە بۆنمونە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆشتندا خێرابووە ئەمە سروشتی خەلقی پێغەمبەرە ﷺ بۆیە ناوترێ با خەڵکـ خێرا بڕوات تا سوننەت تطبیق بکات بەڵکـو ئەوە لە سروشت ـی پێغەمبەر بووە ﷺ نەکـ لە دین ، یان حەزکردن ـی پێغەمبەر ﷺ لەخواردنێکـ ئەمانە کرداری طبع ـن ، بەڵام ئەگەر کەسـێ لەخۆش ویستنی بۆ پێغەمبەر ﷺ کرداره نەریتی و طەبیعیەکان ـی پێغەمبەر ﷺ بکات ئەوا پاداشت ـی بۆ هەیە .

ابن عمر ڕەزای اللّه ـی لێ بێت بەو ڕێگایەدا هەنگاوی دەبڕی کە پێغەمبەر ﷺ پێیدا ڕۆشتبوو .

پاشـان بە سوفیان ـی فەرموو ( **حدثني بحديث من السنة ينفعني اللّه عز وجل به** )

شتێـکم پێ بـڵێ لە سوننەت اللّه تعالى سودمەندم بکات لێی

ئاماژەی ئەوەی تێدایە مرۆڤ بەدوای بەڵگە بگەڕێت لەسوننەت نەیفەرموو بۆچوونی خۆتم پێ بـڵێ بەڵکـو داوای سوننەت ـی لێدەکات واتـا ئەیەوێ عەقـیدەی لەسەر بنەمای سـوننەت ـی سەحیح دابمەزرێنێت نەکـ تەقلید بکات لەسەر وتــەی بێ بەڵگە بۆیـە فەرمووی ( **فإذا وقفت بين يدي اللّه تبارك وتعالى** )

ئەگەر لەبەر دەست ـی اللّه تعالى وەستام

کەواتە مەبەست ـی پرسیارەکەی شعیب بۆ ڕزگاربونییەتی لە ڕۆژی قیامەت نەکـ تەنها کات کوشتن وپرسیارکردن

ـدەفەرموویێت ( **وسألني عنه فقال لي: من أين أخذت هذا ؟** )

کە اللّه لێی پرسـیم ئەم عەقیدەیەت لە کوێ وەرگرت

ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە کە اللّه ـدەفەرمووێت : ﴿ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾ [القَصَص : ٦٥]

واتا : چۆن وەڵامی پەیامبەرانتان دایەوە

جا شـعیب ئەیەوێ لە قیامەت کاتێ ئەو پرسیارەی لێدەکرێت بە علم و سوننەتەوە وەڵام ــی پەروەردگار باتەوە ، چونکە اللّه لێی ناپرسێت چۆن وەڵامــی احمدی کوڕی حنبل و شافعی ومالـیک وسوفیانت دایەوە بەڵــکو لێی ئەپرسێ چۆن وەڵامی پێغەمبەرتان دایەوە ، کە فەرمووی ( **فقال لي: من أين أخذت هذا؟** )

لێی پرسیم ئەم عەقیدەت لە کوێ وەرگرت

واتــا بابەت ــی عەقیدە نابێـت بۆ عەقـڵ وقیـاس وبەبـاش زانیـنـی مرۆڤـەکان بگەڕێنرێتەوە بەڵکو ئەگەڕێنرێتەوە بۆ سەرچاوەکەی کە قورئان وسوننەت وئیجماعە

ـدەفەرمووێت ( **قلت : يا رب، حدثني بهذا الحديث سفيان الثوري** )

منیش ئەڵێم پەروەردگارم سوفیان ــی ثەوری ئەم فەرموودەیەی پێ وتم .

واتا لە قیامەت نەڵێم سوفیان بە ئەقڵ خۆی شتێکی پێ وتم ومنیش وەرمگرت بەڵکو شوێن فەرموودەکەی کەوتم چونکە لە بابەتــی عەقیدە تەقلید جائیز نییە بەڵکو دەبێت شوێن بەڵگە بکەویت .

ـدەفەرمووێت ( **وأخذته عنه، فأنجو أنا وتؤخذ أنت** )

بڵێم لەسوفیانم وەرگرت تامن ڕزگارم بێت و تۆ لێپرسینەوەت لەگەڵ بکرێت .

واتــای ئەوەیە کەسـێک هەوڵ وکۆشش دەدات و دەگەڕێ بە دوای هەق وشوێن ئایەت وفەرموودە دەکەوێت ئەوا بەو شێوەیە ڕزگاری ئەبێت ئەگەر فەرموودەکە

زەعیف بێت ئەم ڕزگاری دەبێت لێپرسینەوە لە زاناکە ئەکرێت کە ئایا بە علمەوە فەرموودەی زەعیف ـی گەیاندووە بە خەڵک یاخود بەتەئویل ـی هەڵە

شعیب فەرمووی ( **فقال لي: يا شعيب! اكتب** )

سفیان فەرمووی ئەی شوعەیب بنووسە واتا سوفیان تێگەشت لەوەی داوای سوننەت ـی لێدەکرێت نەکـ بۆچـوونی خۆی وە ئـەم بابەتـە ئەرکێکی قورسە ولێپرسینـەوەی لەسەرە بۆیە فەرمووی بنووسە واتا نوسینەوەی زانست گرنگیەکی تایبەت ـی هەیە ،

وەپێغەمبەر ﷺ گرنگی بە نووسینەوە داوە وەکـ لە صحیح هاتووە ئیمام ـی بخاری لەکتاب ـی العلم گێڕاویەتیەوە کەپێغەمبەر ﷺ : فەرمووی ( **اكتبوا لأبي شاة** ) بینووسـن بۆ أبی شاة .

لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت ( **احفظوهن، وحدثوا بهن أو أخبروا من ورائي** )

لەبەری بکەن و بیگەیەنن بەوانەی دوای من دێن.

ئاماژەیە کە علم یان لەبەر بکرێت یان بنوسرێتەوە تا لەناو نەچێت.

نوسەر رحمه الله نوسیویەتی [ **بسم الله الرحمن الرحيم** ]

بە بسم الله دەست پێ دەکات کارێکی خۆش ویستراوە

ئەو فەرموودەی کەهاتوە لەبارەی ئەوەی هەرکارێ بە بسم الله دەست پێ نەکات بێ فەڕە ( **كل أمر ذي بال لا يبدأ فيه ببسم الله فهو أجذم أو أبتر** ) ئەمە فەرموودەیەکـی مرسلە واتە سەحیح نییە بەڵام لە پێغەمبەر ﷺ ـەوە هاتوە کە نامەی ناردوە بۆسەرۆکەکان بە بسم الله الرحمن الرحيم دەست ـی پێکردووە

وەکـ عبد اللّه ـی کوڕی عباس ـدەفەرموێت ( **أن رسول اللّه ﷺ كتب بسم اللّه الرحمن الرحيم، من محمد بن عبد اللّه إلى هرقل عظيم الروم** )

پێغەمبەر ﷺ بسم اللّه الرحمن الرحیم ـی نووسی لە محمدی کوڕی عبداللّه بۆ هرقل گەورەی ڕوم.

ئاماژەیە بۆئەوەی کە کارێکی خۆش ویستراوە بەبسم اللّه الرحمن الرحیم دەست پێ بکات ، بەڵام بسم اللّه الرحمن الرحیم بۆ شیعر جائیز نییە

الخطیب البغدادي لە کتابی الجامع لە ئیمام ـی الشعبي گێڕاویەتییەوە فەرموویەتی ( **أجمعوا على أنه لا يكتب بسم اللّه الرحمن الرحيم في ابتداء الشعر** )

یەکـدەنگن کە بسم اللّه الرحمن الرحیم بۆ شیعر نانوسرێت .

---

سـوفیان رحمە اللّه بە شعیب ـی فەرموو بنووسە

( **القرآن كلام غير مخلوق، منه بدأ وإليه يعود، من قال بغير هذا فهو كفر** ).

قوڕئان وتەی اللّه یە ومخلوق نیە لەاللّه ـوە هاتوە وەهەربۆلای اللّه ئەگەڕێتەوە هەرکەسێ پێچەوانەی ئەمەبڵێت ئەوە کوفری کردووە.

قوڕئان وتەی اللّه یە ومخلوق نییە

اللّه تعالى ـدەفەرموویٚت :

﴿ وَإِنۡ أَحَدٌ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴾ [التَّوۡبَة : ٦]

ئەگەر کەسـێ لە موشریکان داوای پەنای لێکردی پـەنای بە تاگـوێ بیستی قسەی اللّه دەبێت .

وە اللّه تعالى ئەفەرموویٚت ﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ ﴾ [ الأَعۡرَاف : ٥٤ ]

دروستکــردن وفەرمانکردن تەنها بۆ اللّه یە

ئیمام ـی احمد لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە ئەفەرموویٚت :

" **أخبر بالخلق ، ثم قال : ( والأمر ) ، فأخبر أن الأمر غير مخلوق** "

اللّه تعالى هەواڵی یاوە کە دروستکردن وپاشان فەرمووی فەرمان کردن هەر بۆ اللّه یە واتــا فەرمان ـی اللّه جیایە لە مخلوق .

رواه صالح ابنه في " المحنة " (روايته ص: 120 – 121).

اللّه تعالى ئەفەرموویٚت :

﴿ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴾

[البَقَرَة : ١٢٠]

ئەگەر شوێن هەواو ئارەزووی ئەوان بکەوی لەپاش ئەوەی زانستت بۆهاتوە لەلایەن اللّه تعالى ـوە ئەوا چیتر هیچ پشتیوانی وسەرخەرێکـت بۆ نابێت لە لایەن اللّه ـوە

**ئیمام ـی احمد لە بەڵگە هێنانەوەی بەم ئایەتە فەرمووی**

**" القرآن علم من علم اللّه ، فمن زعم أن علم اللّه مخلوق فهو كافر "**

**رواه ابن هانئ في " المسائل " (2/ 153، 154)**

**قوڕئان لەزانست ـی اللّه یە هەرکەس پێی وابێت زانست ـی اللّه مەخلوقە ئەوا کـافرە.**

**ئیمام ـی احمد ئەفەرمووێت**

**( قال لي عبد الرحمن القزاز : كان اللّه ولا قرآن . قلت له : فكان اللّه ولا علم ! فأمسك ، ولو زعم أن اللّه كان ولا علم لكفر باللّه ) .**

**عبدالرحمن ـی القزار پێی وتم اللّه هەبووە بەڵام قوڕئان نەبوە وتم اللّه هەبووە و زانستی نەبێت ؟ ئیتر بێدەنگـ بوو ئەگەر بیگوتایە اللّه هەبووە وزانست ـی نەبووە ئەوا کافر ئەبوو بە اللّه . رواه حنبل في " المحنة " (ص: 45).**

**قال تعالى :** ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا ﴾ [الكَهۡف : ١٠٩]

**پێیان بڵێ: ئەگەر بۆ نووسینی وشــەکانی پەروەردگارم دەریا گشت مەرەکەب بێ تا حیکمەت و نهێنیەکانی ئەویان پێ بنووسرێ پێش لەکۆتایی هێنانی وتەو بڕیارەکانی پەروەردگارم دەریا هەموو هەڵدەچۆڕێ ئەگەرچی ئەوەندەی تریشیان فریاخەین بۆ کۆمەکییان، هێشتا هەر کۆتاییان نایەت.**

**<u>کەواتــە قوڕئان وشە کەلامــی اللّه تعالى یە</u>**

## کێ ئەم فیتنەیەی داهێنا کە گوایە قورئان اللّه دروست ـی کردووە و قسەی اللّه نیە ؟

یەکەم کەس کە ئەم بیدعە کوفریەی داهێنا

جەعدی کوڕی درهم بوو جەهمی کوڕی سەفوان لە جەعد وەریگرت دوواتر واصل ـی کوڕی عطائی موعتەزیل ـی شوێن ئەم وتە کەوت

شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه اللّه تعالى ئەفەرمووێت :

( **فلم يقل أحد من السلف بهذين القولين أبداً، ولم يقل أحد منهم: إن القرآن عبارة عن كلام اللّه ولا حكاية، ولا قال أحد منهم: إن لفظي بالقرآن مخلوق بل كان السلف يقولون: ما دل عليه الكتاب والسنة من إثبات صفة الكلام للّه تعالى على ما يليق بجلال اللّه وعظمته** ).

هیچ یـەکێ لە سەلەف نەیگوتوە قورئان گوزراشتە لە قسەی اللّه وە هیچ کەسێ لە سەلەف نەیگوتووە لەفزی ئێمە بەخوێندنەوەی قورئان مەخلوقە بەڵـکو سەلەف ئەوەیان دەگوت کە قورئان وسونەت بەڵگەن لەسەری لە جێگـیرکردن ـی سیفەت ـی قسە بۆ اللّه تعالى بەوشێوەیەی شایستەیە بە گەورەی وجەلالەتی اللّه تعالى.

بۆیە ئەم فیتنەیە کاتێ بڵاوەی کرد ئیمام ـی سوفیان هەستی بەمەترسی ئەم بیدعە کوفریە کـرد بۆیە دەست پێیکی کتێبەکەی بەو ڕەدانەوەی کوفری سەردەمەکەی خۆی دەست پێدەکات ، لێرەوە تێدەگەین ئەهلی سـونەت ئەهلی عەدل وهەقـن هەر کوفرێ لەسەردەمێ بڵاوبوبێت جەختیان لەسەر ئاگادارکردنەوەی موسڵمانان کردووە تانەکەونە نێو ئەوکوفرەوە.

ئەبینیت ئیمام ـی سوفیان دوای بسم اللە بەباسكردنی ئەم لایەنە عەقیدەییە دەست پێدەكات چونكە كوفری بەربڵاوی سەردەمەكەی ئەو كوفرە بووە ، واتا لەسەردەمەكەت هەر كوفرێ بەربڵاو بوو دەبێت سەرەتا لەو كوفرەوە دەست پێ بكەیت ، بۆ نموونە لەسەردەمی شێخ محمد ـی كوڕی عبدالوهاب كوفری گۆڕپەرست ـی بەربڵاوبوو جەختیان لەسەر ئەولایەنە دەكردەوە و سێ بەشی دەعوەكەیان دژایەتیكردن بوو بۆشیركی گۆڕپەرستی چونكە كوفری سەردەمەكەیان ئەوەبوو.

وە لەسەردەمی ئەمڕۆمان ـدا ئەو كوفرەی موسڵمانانی بەرەو مورتەدبوونەوە بردووە كوفری عەلمانیەت و دیموكراسیەت و یاسا دەستكردەكان ـی مرۆڤە ، كە زانایانی سەردەم پێشەكی دەعوەكەیان تەرخان كردووە بۆ هۆشیاركردنەوەی خەڵك لەم كوفرە بۆیە ناكرێ تۆ لەم ڕۆژەدا واز لەباسكردنی زەقترین كوفر بهێنیت بڕۆی باسی كوفرێ بكەی كە لەم سەردەمەدا تەنها گروپێك لەسەر ئەو كوفرەن بەڵام سەدا 90 ـی گروپەكان لەكوفری عەلمانیەت ودیموكراسیەت ـدان ، تۆ بەباسكردنی كوفری كەمینەیەك وازت هێناوە لەڕووبەڕووبونەوەی كوفری سەدا 90 ـی خەڵكی سەر زەوی .

یەكێ لە زاناكان ئەفەرموویێت ( **من نزل في بأرض قد تفشى فيها الزنا فحدث الناس عن حرمة الربا فقد خان اللّه و رسول اللّه** ).

هەر كەس لە خاكێكدا بێت ئەو خاكە زینای تێدا بەربڵاوبێت ئەو باس ـی حەرامێتی ڕیبا بۆ خەڵك بكات ئەوا خیانەت ـی كردووە لە اللّه وڕسولەكەی.

بۆیە ئێستا حەمدانیەكان وعمومیەكان ومەدخەلیەكان هێندە باسی كوفری خەلق ـی قورئان ئەكەن نیو چارەك باسی كوفری عەلمانیەت ناكەن بەڵكو بە پێچەوانەوە

کوفری یاسا دەستکردەکان ئاسانتر ئەکەنەوە وبە کوفری دەرخەر لە ئیسلام ـی دانانێن وە سیخوڕیکــردن بۆ دووژمنانی ئیسلام بە کوفری دەرخەر لەئیســلام نازانن واتــا ئەم گروپانە بەشـێکن لەو هاوکێشەیە کە لە بڕی ترساندنی خەڵــک لەکوفری دەسەڵاتدارانی عەلمانیەت خەڵکــی مشغوڵ ئەکەن بە کوفری کۆمەڵێ لات وپوتی ئەشـعەریەکان کە مەنجەڵێ یاپراخ بەشی هەموو ئەشاعیرە ئەکات بۆیە ئەم هاوکێشەیە پیلانی ڕۆژئاوایە بۆ سەرقاڵکردنی موسڵمانان بە کوفرێ کەپێش 1200 ساڵ لەمەوپێش بوە بۆ ئەوەی کوفرە سەردەمیەکە لە بیری خەڵکـ بەرنەوە تا خەڵکـ ڕانەپەڕێت وڕانەچەڵەکێت لە کوفری عەلمانیەت ودیموکراسیەت .

ئەمە لە کاتێکـدا کوفری قورئان مەخلوقە کوفرێکە بە سیفاتێکی اللّه تعالی وە هەر کەسێک جاهیل بێت بە سیفاتێـکێ اللّه ئەوا لەسونەت و وتەی سەلەف عوزری پێدراوە بە نەزانین دوای ڕونکــردنەوە ئەگەر دان نەنێت بەو سیفەتەی اللّه تەکفیر ئەکرێت چونکـە ناسینی سیفەتە خەبەریەکانی اللّه تعالی بەئەقـڵ نازانرێت بەڵــکو ئەبێت بەدەق بگەیەنرێت بەخەڵکـی وخەڵکی لێ فێربکرێت دوای فێرکردن ئەوەی ملکەچ ـی نەبێت تەکفیر ئەکرێت .

بەڵگــە لەسونەت لەسەر عوزری ئەوکەسەی جاهیلە بەسیفەتێکی اللّه تعالی

پێغەمبەر ﷺ بەسەرهاتی پیاوێ دەگێڕێتەوە کە ئەم پیاوە هێندە تاوانی زۆر بــوو وەسێت ـی بۆمنداڵەکانی کرد وتی گەر مردم ئەوا بمسوتێنن و خوڵەکەم بەن بەدەم شەپۆلی با ودەریاوە چونکە خۆ ئــەگەر اللّه بتوانێ زیندووم کاتەوە ســزایەک سزام

ئەیات سزای کەس ـی نەیابێت بۆیە کوڕەکان ـی وەسێتەکەیان جێ بەجێکرد ، کاتێ لە قیامەت ـدا اللّە لێی ئەپرسێ بۆچی واتکرد ، پیـاوەکە دەڵێت لە ترس ـی تۆ ئەی پەروەردگارم اللّە ـش بەوهۆیەوە لێی خۆشەبێت

(( **أسرف رجلٌ على نفسه، فلما حضره الموتُ أوصى بنيه فقال: إذا أنا مت، فأحرقوني، ثم اسحقوني، ثم اذرُوني في الريح في البحر، فواللّه لئن قدَر عليَّ ربي ليعذبني عذابًا ما عذَّبه به أحدًا، قال: ففعلوا ذلك به، فقال للأرض: أدِّي ما أخذتِ، فإذا هو قائم، فقال له: ما حملكَ على ما صنعتَ؟ فقال: خشيتُك يا رب - أو قال: مخافتك - فغفر له بذلك** ))

( رواه الشيخان )

کە واتـا ئەم پیاوە جاهل بووە بەسیفەتی دەسەڵات ـی اللّە کە ئەم سیفەتەی اللّە بە ئەقڵ وفیطرەتیش دەزانرێت کەچ ـی هێشتا اللّە تعالى عوزری لـێ قبوڵ کرد .

## بە تێگەیشــتنی سەلەف وزانایان

ئیمام ابن قتيبة – رحمه اللّە - ـدەفەرموویێت : ( **قد يغلط في بعض الصفات قوم من المسلمين، فلا يكفرون بذلك** ) ((شرح مسلم)) للنووي (٥/ ٥٩٨ – ٥٩٩).

کەسانێ لە موسڵمانان هەڵە دەکەن لە هەنێ سیفاتی اللّە تعالى بەوە کـــافرنـــابن.

ئیمام شافعی رحمه اللّە ـدەفەرموویێت :

( **للّه أسماء وصفات لا يسع أحداً ردها، ومن خالف بعد ثبوت الحجة عليه، فقط كفر. وأما قبل قيام الحجة، فإنه يعذر بالجهل** ) ((فتح الباري)) (١٣/ ٤٠٧).

اللّه تعالی ناو وسیفاتی هەیە جائیزنیە هیچ کەسێ ڕەدی بکاتەوە هەرکەسێ پێچەوانەی بکا لەپاش ئیقامە حوجە ئەوا کافرە بەڵام پێش ئیقامە حوجە عوزری بۆهەیە بەنەزانین.

<u>بەڵکـو ئیجماع ـی ئەهلی سونەت لەسەر ئیقامە حجەی جەهمیەکان ثابت بووە</u>

ئیمام ابن ابي عاصم الشيباني (ت 287 هـ) ـدەفەرمووێت :

( **ومما اتفق أهل العلم على أن نسبوه إلى السنة... - والقرآن كلام اللّه تبارك وتعالى تكلم اللّه به ليس بمخلوق، ومن قال: مخلوق، ممن قامت عليه الحجة فكافر باللّه العظيم، ومن قال من قبل أن تقوم عليه الحجة فلا شيء عليه** )

ئەوەی ئەهلی علم لەسـەری کۆڕان وداویانەتە پاڵ سـونەت ... لەوانە قورئان وتەی اللّه یە وقسەی پێکردووە ومخلوق نیە وەئەوەشی بڵێت مخلوقە ئەگەر ئیقامە حجە کـرابێت ئـەوا کافـرە بـە اللّه تعالـی وە ئـەگەر پێـش ئیقامـە حوجـە وابڵێـت هیـچ ـی لەسەرنیە . کتاب السنة لە 645/2

ئـــــیمامی بوخـــــاری (ت 256 هـ) لەبارەی ئەعیانی جەهمیەکانەوە دەفەرمووێت :

(**وكل من لم يعرف اللّه بكلامه أنه غير مخلوق فإنه يعلم، ويرد جهله إلى الكتاب والسنة، فمن أبى بعد العلم به، كان معاندا، قال اللّه تعالى:** ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ﴾ [التَّوۡبَة : ١١٥].

هەرکەسێ اللّه نەناسێت بەوتەکەی کەباوەڕی وابێت قورئان مەخلوق نیە ئــەوا ئەوکــەسە فێردەکرێت و جەهلـــەکەی لادەبرێ بەقورئان وسونەت گەر پاش زانست ملکەچ نەبوو ئەوا کەسێکــی عینادە اللّه فەرموویەتی :

﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمَۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ﴾ [التَّوْبَة : ١١٥]

خوٚ پاش ئەوەی اللّه خەڵکێکی خستبێتە سەر ڕاستەڕێ ، ئیتر نەبووە جارێکی تر گومڕایان بکات ، تا ئەو شتانەیان بوٚ ڕوون بکاتەوە کە دەبێ خوٚیانی لێ پارێزن .

ئیمام عون بن یوسف رحمه اللّه

أبو بكر المالكي -رحمه اللّه- له رياض النفوس": دەیگێڕێتەوە

سليمان بن سالم دەڵێت : **من دانیشتبووم لەلای عون بن یوسف سێ کەس هاتن وتیان**

**«مات عندنا رجل يقول بخلق القرآن، فما نصنع به؟» فقال: «إن وجدتم من يكفيكم مؤنته فلا تقربوه»، فسكتوا ثم أعادوا السؤال ثانية فأجابهم بمثل الأول. ثم أعادوا السؤال ثالثة، فأجابهم بمثل ذلك، فقالوا: «لا نجد من يكفينا مؤنته» فقال لهم: «اذهبوا فواروه من أجل التوحيد».قال سليمان: «يريد تغسلونه وتكفنونه وتصلون عليه وتدفنونه»**

پیاوێ لای ئێمە مردووە دەیگوت قورئان مەخلوقە چی لێ بکەین ؟

فەرمووی گەر کەسانێ هەن بەڕێی بخەن ئێوە لێی نزیک مەبەنەوە ، بێدەنگبوون پاشان پرسیارەکەیان دووبارەکردەوە تا دووجار جار بەوشێوە وەڵامی یانەوە لەجاری سێهەم وتیان کەس نیە مەراسیمی مردنەکەی بەڕێوەبەرێت ، ئیمام فەرمووی بڕوٚن مەراسیمەکەی بوٚ بەڕێوەبەرن لەبەر خاتری تەوحید

سولەیمان دەفەرموێت مەبەستی عون بن یوسف ئەوەبوو واتا بڕوٚن بیشوٚن و کفن ی بکەن و نوێژی لەسەر بکەن و دەفن ی بکەن.

کەواتــە کوفری قورئان مەخلوقە کوفرێکی گەورەیە بەڵام خاوەن وتە کــافر ناکرێت تابۆی ڕوون دەکرێتەوە ، بە پێچەوانەی کوفری عەلمـانیەت کە کوفرێکی ئاشـکرایە هیچ عوزر بە جەهل وتەئویل ـیٚ نییە بۆکەسیٚ کە ببێت بە عەلمانی وعەلمانیەت سـەربخات .

وەکوفری قورئان مەخلوقە هێندە بڵاوبوویەوە تەنانەت سیٚ لە خەلیفەکان (مەئمون ، وموعتەصم . واثق ) بون بەهەڵگری ئەم بیدعە کوفریە وە سزا وئەشکەنجەی ئەهلی سـونەتیان ئەیا ، تەنانەت کەسێکی وەکـ ئیمام احمد چەندین جار لە پێش چاوی ئەو خەلیفانە ڕەدی زانا جەهمی وموعتەزیلەکانی ئەیایەوە بەبەڵگە دەیسەلماند کە قورئان مەخلوق نیە و وتەی اللّه یە .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا تەکفیری ئەو خەلیفانەی نەکـرد وبە بـــرا ناوی دەبردن و دەیفەرموو دەست هەڵمەگرن لە گوێڕایەڵیکردنیان (جا شتێکی ڕوونە کافر گوێڕایەڵی بەسەر موسڵمانانەوە بۆنیە جائیمام نەیفەرموو خرۆج مەکەن بەڵکــو فەرمووی دەست لەگوێڕایەڵیان هەڵمەگرن ).

ئــیمام احمــد معتصم ـی جەهمی عەقیدەی بە بــرای خۆی زانیوە

ـدەفــەرموویــت ( وقد جعلت أبا إسحاق "المعتصم" في حل ورأيت اللّه عز وجل يقول وليعفوا وليصفحوا ألا تحبون أن يغفر اللّه لكم وأمر النبي ﷺ أبا بكر بالعفو في قضية مسطح، ثم قال أبو عبد اللّه: العفو أفضل، وما ينفعك أن يعذب أخوك المسلم بسببك ولكن تعفو وتصفح عنه، فيغفر اللّه لك كما وعدك ).

( گەردنی باوکی ایسحاق [ معتصمم] ـم ئازادکـــــرد چونکە اللّه تعالی فەرموویــەتی لێبوردە بن ئایا ناتانەوێ اللّه لێتان بـبـورێـت وە پێغەمبـەر ﷺ فەرمان ـی بــە أبــو بکـر کــرد بــە لێبــوردەیـی لـە ڕووداوەکــەی مسطح ) .

ئیمـــام ـی ئەحمەد دەفەرمووێت :

( لێبوردن چـــاکترە چی سودێکت پێ دەگا ئەگەر براکەو بەهۆی تۆوە سزا بدرێت لەقیامەت بەڵکو لێخۆشبون چونکە خوا لەتۆش خۆش دەبێت ).

( المحنة عبدالغـــنی المقدسي 92 )

ئیمامی احمد خەلیفەی جەهمی واثق ـی تەکفیر نەدەکرد ئەو واثقەی ئیمام احمد بن نصر الخزاعی خڕوجی لێکرد وئیمام احمدی کوشت .

علي بن عیسی فەرموویەتی : گوێم لەحەنبەل بوو لە ویلایەتی واثق ـدا کە فوقەهایانی بەغداد هاتن بۆ لای ابو عبداللّه

أبو بكر بن عبيد وإبراهيم بن علي المطبخي وفضل بن عاصم هاتن بۆلای ئیمام احمد باسیان کرد بۆ ئیمام احمد کە وتەی قورئان مەخلوقە بڵاوبۆتەوە

جائیمام احمد فەرمووی چیتان دەوێ؟

وتیان ئێمە هاتوین ڕاوێژت پێ بکەین کەڕازی نین بە فەرمانڕەوایەتی ودەسەڵاتی واثق ، ئیمام احمد گفتوگۆی لەگەڵ کردن وپاشان پێیانی فەرموی لەدڵەوە پێتان ناخۆش بێت

**دەست هەڵمەگرن لەگوێڕایەڵی سەركردە**

**ڕیــزی موســـــڵمانان پارچەپارچە مەكەن**

**خوێنی خۆتان وموسڵمانانیش مەڕێژن لەگەڵ خۆتان**

**الخلال في "السنة" (1/133-134).**

**ئەگەر ئیمام احمد واثق ـی پێ موسڵمان نەبوایە نەیدەفەرموو دەست هەڵمەگرن لە گوێڕایەڵی كردنی وە نەیدەفەرموو ڕیزی موسڵمانان شەق مەكەن .**

**جا ئەم عەقیدەیە ئەسڵەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ یەهود كە جەهمی كوڕی سەفوان لە جەعد وەریگرت ئەویش لە خوشكەزاكەی لبیدی كوڕی الاعصم ـی وەریگرت وە جەعدی كوڕی درهـەم سەربڕدرا لە لایەن خالیدی قەسـڕی وكردی بەقوربان ـی لەڕۆژی جەژن ـی قوربـان.**

---

**ئیمامـی سفیان فەرمووی**

**( وَالْإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ وَنِيَّةٌ )**

**ئیمان وتەوكردار ونیەتە**

**ئەهلی سونەت تێــكڕا یەكدەنگن لەسەر ئەوەی ئیمان بریتییە لە وتە وكردار و بیروباوەڕی دڵ.**

ئیمام ـی الشافعي رحمه اللّه ئەفەرموێت: "**وكان الإجماع من الصحابة والتابعين، ومن بعدهم، ومن أدركناهم؛ يقولون : الإيمان قول وعمل ونية، لا يجزئ واحد من الثلاث إلا بالآخر** ".

ئیجماع لەسەردەمـی صحابە وتابعین ودوای ئەووانیش وئەوانەشی کەئێمە پێیان گەیشتوین هەموویان وتویانە ئیمان وتە وكردار ونیەت ـی دڵە ئیمان دروست نابێت بەبێ بونی یەکێ لەم سـێ خاڵە . " أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي " (956/5).

ئیمام ـی البخاري رحمه اللّه ئەیفەرموو

" **كتبت عن ألف نفر من العلماء وزيادة، ولم أكتب إلا عمن قال: الإيمان قول وعمل، ولم أكتب عمن قال: الإيمان قول** ".

نوسیومە لە هەزار زانا وزیاتریش هەر هەموویان وتویانە ئیمان وتە وكردارە وە ئەوانەی وتویانە ئیمان تەنها وتەیە لێم نەنووسیون

" أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي" (959/5) رقم (1597).

**بەڵگەی ئەهلی سوننەت چییە لەسەر ئەوەی ئیمان وتە وكردارە ؟**

( واتە وتەی زمان و وتەی دڵ لەگەڵ كرداری دڵ وكرداری لاشــە )

ئەهلی سـونەت وجەماعە ئەفەرموون ئــیمان بەدی نایـەت ئیلا

① لە دڵــەوە بڕوای بەڕاستی هەموو وتەكانی اللّه هەبێت ئەمە وتەی دڵە وە هەروەهــا لە دڵەوە ملـــكەچی تەواوی فەرمانەكانی اللّه بێت وپێی ڕازی بێت و خۆشی بوێت وبۆ فەرمانەكانی اللّه دڵسۆزبێت ئەمــە كرداری دڵــە .

② بەزمــــــان دان بنێت بەڕاستی بوونی هەمو فەرمانەکانی اللّە .

③ بەکـــــردار هەستێ بەجێ بەجێکردنی فەرمانەکانی اللّە وە کرداری نەکات کە ببێتە هۆی هەڵوەشـاندنەوەی ملکەچ بونی بۆ فەرمانەکانی اللّە ، خۆ ئـەگەر کردار نەکات بۆ اللّە ئەوا ئـیماندار نییـە وکافرە با لەدڵیشـەوە باوەڕی هەبێت و بەزمانیش دانی پێدا بنێت .

**بەڵگە لەسەر ئەوەی وتەی زمان لە ئیمانە**

قال تعالی : ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ ﴾ [ البَقَرَة : ١٣٦ ]

بڵێــــن ( بە زمان ) ئیمانمان هێناوە بە اللّە وە بەوەشــی بۆمان دابەزیوە و بەوەشی بۆ ابراهیم دابەزیوە .

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموویت :

( **أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَمَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي نَفْسَهُ وَمَالَهُ إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ** ) رواه البخاري (2946)، ومسلم (21).

فەرمانم پێکراوە بجەنگـم لەگەڵ خەڵکـیدا تا شایەتی ئەڵێنەوە بە لا الە الا اللّە هەرکەس وتــــی لا الە الا اللّە خوێن وماڵی لەسەرم حەرام ئەبێت تەنها بە مافەکانی ئیسلام نەبێت وە لێپرسینەوەشی لەلای اللّە یە.

ئەم فەرموودەیە هەرسێ بەشەکەی ئیمان باس دەکات

رَسُولُ اللّهِ ﷺ ئەفەرموویت : **الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ - أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ - شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّهِ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ .**

ئیمـان حەفتاو وئەوەندە بەشە یان شەست وئەوەندە بەشە بەرزترینی وتنی لااله الااللّه یە (وتەی زمـان) وەکەمترین پلەی ئیمان لادانی نارەحەتیەکە لەسەر ڕێـگـا (جۆرێکی کرداری لاشـە) وەشەرمکردن بەشێکە لەئیمان (کرداری دڵە).

رواه البخاري (9) ومسلم (35)

بەڵگـە لەسەر ئەوەی وتەی دڵ بەشـێکە لە ئیمان قال تعالى : ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَـٰنَ ﴾ [المُجَادلَة : ٢٢] ئەوانــە ئیمان لەدڵیاندا نوسراوە .

بەڵگـە لەسەر کرداری دڵ

﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَـٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَـٰهُمۡ يُنفِقُونَ ۝٣ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗا ﴾ [الأَنفَال : ٢ - ٤]

باوەڕدارانی ڕاستەقینەو هەر ئەوانەن کە هەرناوی اللّه هێنرا، دڵیان لەبەر گەورەیی ئەو دەکەوێتە لەرزە ( ترسان لەاللّه کرداری دڵە ) وترسی لێدەنیشێت هەر کە ئایەتەکانیشی دەخوێنرێنەوە بەسەریاندا باوەڕیان زیادو بەهێز دەبێ (بــەڵگەیە لەسەر زیادکردنی ئیمان بەچاکـە) هەر بەپەروەردگاریشیان پشت دەبەستن (دیسان

کرداری دڵە ) ئەوانەی کەنوێژ ئەکەن ولەو سامانەی پێمان بەخشیون لەپێناو اللّە ئەبەخشن ئائەوانە ئیمـــــاندارن بەڕاستی وبەهەق.

## بەڵگــەی کـە لەسەر کرداری لاشـە

قال تعالى: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾ [البَيِّنَة : ٥]

فـەرمانیان پێ نەدرابوو تەنهـا بەوە نەبێ کە بە تەواوی اللّە بپەرستن و سەر تەنها بۆ ئەو دانەوێنن و ئایینەکەیان تەنها بۆاللّە یەکلابـکەنەوە و لە هەموو ئایینێکی هیچ و پوچ لابدە و بە تێرو تەسەل نوێژەکانیان بکەن و لە ماڵ و سامانیان زەکات بدەن بەو شێوەیەی بۆیان ڕوونکراوەتەوە ( نوێژ وزەکات کرداری لاشـەیە) وە هەر ئەو و یەکلابوونەوەیە بۆاللّە ونوێژو زەکات دانەیە، ئایینی پایەدارو ڕاستیە.

اللّە تعالى ئەفەرموێت :

﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمۡ ﴾ [البَقَرَة : ١٤٣]

اللّە تعالى پاداشتی ئیمانەکەتان بەفیڕۆ نایـات (ئیمام ـی بوخاری ئەفەرموێ واتە ئەو نوێژانەی کە پێشتر ڕووتان لە بیت المقدس کردووە واتــا اللّە تعالى نوێژی بەئیمان ناوبرد) "بَابٌ: الصَّلاَةُ مِنَ الإِيمَانِ."

**ێچەوانکارانی ئەهلی سونەت لەبارەی ئیمانەوە چەند جۆرێکــن**

**یــەکەم // مورجیئەکان**

**جۆرەکــانی مورجیئــە**

① **جۆری یەکـەم - ئەوانـەن کەدەڵێــن ئیمــان بریتیە لەناسینی اللّه بەدڵ ئەگەر بەڕاست دانانی اللّه شــی لەگەڵ نەبێت ئەمانەش جەهمیەکان بون وایان دەوت.**

② **جۆری دووەم ـ ئەڵێن ئیمان بریتیە لەبەڕاست دانان لەدڵەوە ئەمەش وتەی ئەشعەریەکانە ئەمەش وتەیەکی باطـل ـە چونکە اللّه لەبارەی موشریکانەوە ـدەفەرمووێت**

﴿ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾ [الأَنْعَام : ٣٣]

**ئــەوان تۆ بەدرۆ نازانن بەڵام ستەمکــاران نکوڵی لەئایەتەکانی اللّه ـدەکەن.**

**لەدڵەوە باوەڕیان هەبوو کە پێغەمبەر ﷺ ڕاستە و بەڕاستیان دەزانی بەڵام بە زمان دانیان پێدا نەدەهێنا هەربــۆیە اللّه بە نکوڵی کار لەئایەتەکانی اللّه وەسفی کردن .**

③ **جۆری سێــهەم ـ کرامیە ـ ئەوانەن کەدەڵێن ئیـمان ئەوەیە بەزمان دانی پێدا بنێت ئەگەرچی باوەڕیشی پێ نەبێت لەدڵەوە ئەم وتەیەش باطـل ـە چونکە مونافیقەکان بەزمان دانیان بەئیسلام دەهێنا بەکردەوەش شوێن ـی دەکەوتن بەڵام لەدڵەوە ئیمانیان پێ نەبوو اللّه بەکافر وەسفی کردوون .**

**اللّه ـدەفەرمووێت :** ﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴾ [المُنَافِقُون : ١]

کاتێ دووڕووەکان هاتن بۆلات ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەڵێن: شایەتی ئەدەین کە بەراستیی تۆ پەیامبەری اللّه ـی لە حاڵێکدا اللّه خۆی دەزانێ کە تۆ پەیامبەری ئەویت وە اللّه شاهیدی دەدات کە ئەو دووڕووانە درۆ دەکەن کە ئەڵێن تۆ پەیامبەری اللّه ـی سوێندە درۆیینەکانیان کردوە بەقەڵغان بۆ پاراستنی ئابڕوو و سەرو ماڵی خۆیان، هەر شتێک دێتە پێشێ، بە خێرایی ئەوان سوێندێکی پیا دەکێشن! ڕێی دینی اللّه یان لە خەڵک گرت! نەیان دەهێشت کەسێک بێتە ناو دینی اللّه ـەوە تا بۆیان کرابا بە سوێندی درۆو دەلەسە خەڵکیان لە خشتە دەبرد بەراستیی ئەوانە کارێکی خراپ و نا بەجێیان کرد.

وە اللّه تعالی ـدەفەمووێت :

﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَـٰكُمْ ۗ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَـٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴾ [آل عِمْرَان : ١٦٧]

ئەودووڕووانەش لە ڕێگادا موسڵمانەکان پێیانگەیشتن وپێیان گوتن: وەرن لەڕێگای خوادا جەنگ بکەن، یان دیفاع و بەرگری بکەن کەچی لەوەڵامدا وتیان: ئەگەر بزانین ئێوە تووشی جەنگ وکوشتار دەبن، دڵنیابن دەسمان لێ بەر نەدەدان و، دواتان دەکەوتین و دەجەنگاین، دیارە ئەمەش خۆدزینەوەو جۆرە ڕاکردنێک بوو لەراستییەکان، ئینجا قورئان وەڵامێکی ئەمەیان دەداتەوەو ئەفەرموێ ئەوانە کە - ئەوڕۆژە ئەوقسەیان کرد- لەکوفرەوە نزیکتربوون تا لەئیمان و باوەڕەوە، چونکە یارمەتی موسڵمانانیان نەداو ئەو بیانووەشیان بەفرۆفێڵ هێنایەوە ئەوی بەزمان دەیڵێن، لەدڵیاندا پێچەوانەی قسەی زمانیانە ، وە اللّه چاک دەزانێ بەوەی لە دڵا دەیشارنەوە.

④ جۆری چوارەم ئەوانەن کە دەڵێن

ئیمان باوەڕی دڵە وە وتەی زمانە

ئەمەش دیسان باطلە

چونکە کەسانێ لە جولەکە هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەزمان وبەدڵ دانیان بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ دانا بەڵام شوێنی نەکەوتن بەکردەوە لەترسی گەلەکەیان ئەمەش نەیکردن بە موسڵمان .

⑤ جۆری پێنجەم وتەی بەشێ لە ئەشعەریەکان و ئیمام ـی ابن حجر ـە رحمە اللّە کە دەڵێن ئیمان باوەڕی دڵە وە وتەی زمانە وە کردارە بەڵام کردار جوانی ئیمانە واتا ئەگەر کرداریشی نەبێت هەر موسڵمانە .

لە الفتح 1 / 61 ـدەفەرموێت :

**فالسّلف قالوا : هو اعتقادٌ بالقلب ونطقٌ باللّسان وعملٌ بالأركان ، وأرادوا بذلك أنّ الأعمال شرط في كماله .**

سەلەف کەوتویانە ئیمان باوەڕی دڵ ـە و وتەی زمانە و کردارکردنە بە پایەکانی ئیمان مەبەستیان بەکردار ئەوەبوە مەرجە بۆ کامل بونی ئیمان (واتا نەك کردار ئەصڵ ئیمان بێ).

ئەم وتەیەی ئیمام ـی ابن حجر بیدعەی ئیرجائە اللّە لێی خۆش بێت هەڵەیەکی زۆر گەورەیە

ئیمام ـی إسحاق بن راهویە رحمـه اللّه لەساڵی 238هـ وەفاتی کردوە ـدەفەرمووێت :

( **غلت المرجئة حتى صار من قولهم: إن قوما يقولون: من ترك المكتوبات، وصوم رمضان، والزكاة، والحج، وعامة الفرائض من غير جحود بها لا نكفّره، يرجى أمره إلى اللّه بعد؛ إذ هو مقر. فهؤلاء المرجئة الذين لاشك فيهم** ).

مورجیئـەکان زیادە ڕەویان کرد تاوایان لێ هاتوە دەڵێن هەرکەسێ واز لەنوێژە فەرزەکان بهێنێت واز لەڕۆژوی ڕەمەزان و زەکات دان وحەجکردن وهەموو فەرزەکان بهێنێت وجەحدی نەکات بەدڵ وبەزمان ئێمە تەکـفیری ناکەین لای اللّه دەمێنێتەوە (کەلێی خۆش بێت یان سزای بدات ) چونکە دان دەنێت بەشەریعەتی اللّه جائەم کەسانە گومانی تێدانیە کەمورجیئەن .

کەواتـا ئەوکەسەی کردار تەرک دەکات کافرە ئەصڵی ئیمانی لە دەست دەدات نەک ئیمانی ناقص بێت مسائل الامام احمد واسحاق بن راهويه لحرب الكرماني، (ص377).

⑥ جۆری شەشەم دەڵێـن ئیمان باوەڕهێنانە بە دڵ وزمان وکردار بەڵام لە هەمان کاتدا نەمانی کرداری لاشە بە نیشانەیەک دانانێن بۆ نەمانی ئیمانی دڵ ئەمەش لازم ـی وتەی حەمدانیەکان ومەدخەلیەکانـە لە کاتێـکدا ئیمانی دڵ بەدوو مەرج دادەمەزرێت وەک ئیمام ـی ابن قیم دەفەرموێت رحمـه اللّه

**فالتصديق إنما يتم بأمرين: أحدهما اعتقاد الصدق، والثاني محبة القلب وانقياده،**

بــەڕاست دانانی شەرعی اللّه بە دوو مەرج دێت

یەکەم لەدڵەوە باوەڕی بە ڕاست بوونی هەبێ

دووەم خۆشی بوویت لەدڵەوە وە ملـکەچی بێت

**ولهذا قال تعالى لإبراهيم: ﴿ يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ ۝١٠٤ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ﴾ [الصَّافَّات : ١٠٤ - ١٠٥] ، وإبراهيم كان معتقداً لصدق رؤياه من حين رآها، فإن رؤيا الأنبياء وحي، وإنما جعله مصدقاً لها بعد أن فعل ما أمر به،**

هەربۆیە اللّه بە ابراهیم ـی فەرموو ئەی ابراهیم خەونەکەت بەڕاست خستەوە ـ ابراهیم پێش ئەوەی بچێ بۆ لای اسماعیل باوەڕی بەڕاستی خەونەکەی هەبوو چونکە خەونی پێغەمبەران وەحییــە بەڵام کاتێ بە کردەوە ویستی خەونەکەی جێ بەجێ بکات اللّه پێیی فەرموو خەونەکەت بەڕاست خستەوە (کەواتا بەڕاست دانانی فەرمانی اللّه تەنها عەقیدەی دڵ نییە بەڵکـو کرداریشە).

**وكذلك قوله : ((وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ)) (46) ، فجعل التصديق عمل الفرج ما يتمنى القلب، والتكذيب تركه لذلك، وهذا صريح في أن التصديق لا يصح إلا بالعمل. وقال الحسن: ليس الإيمان بالتمني ولا بالتحلي، ولكن ما وقر في القلب وصدقه العمل.**

وەبەهەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ کەباسی هەنگاوەکانی زینا دەکات دەفەرموێت (ئەندامی زاوزێ ئەو نیەتی زینایە بەڕاست ئەخاتەوە یان بەدرۆی ئەخاتەوە ) پێغەمبەر ﷺ بەڕاست خستنەوەی نیەتی دڵی پەیوەست کرد بە کرداری ئەندامی زاوزێ وە ئەنجام نەدانی زیناکە بەکرداریش بەدرۆخستنەوەی نیەتی زیناکەیە ئەمــەش زۆر ڕونە کەبەڕاست دانان نایــەت ئیلا بەکردار نەبێت وە حسن فەرموویەتی ئیمان بە خۆزگە خواستن و خۆ وەسف کردن نیە بەڵکـو بە جێگیربونیەتی لەدڵ و بەڕاست خستنەوەی بەکردار.

**خەواریـــجەکان ئەڵێن ئیمان وتە وکردارە هەرکەسێ کردارێــکی لێ دەرکەوێ پێچەوانەی شەرع بێت یان واز لە واجبێــک بێنێت کافر ئەبێت**

بۆیە پێیان وایە هەرکەسێ تاوانێ بکات وەک زینا یان دزی ئەوا کافرە لە دوونیـا وقیامەت ، وە موعتەزیلەکـان پێیـان وایـە هەر کەســێ تاوانێ بکات نە کافـرە نەموسـڵمانە بەڵام لە قیامەت بۆ هەمیشە لە دۆزەخ دەمێنێتەوە

بەڵام ئەهلی سونەت مامناوەند

پێیان وایە نەبونی کردار واتــا نەبوونی ئیمان

بەڵام هەر نەکردنی کردارێــک لە شەرعدا بکەرەکەی بە کافر ناونەنرابێت ناڵێن ئەوکەسە کافرە وە کردنی هەرکردارێــک لە شەرعدا بکەرەکەی بەکافر ناونەنرابێت ناڵێن ئەوکەسە کافرە

پاشــان ئیمام ـی سفیان ئەفەرموویێت ( ئیمان )

**يَزِيدُ وَيَنْقُصُ** (ڕەدە بۆ مورجیئە کەپێیان وایە ئیمان زیاد وکەم ناکات) ، **يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ**

ئیمان زیاد وکەم ئـەکات زیاد ئەکات بەگوێڕایەڵی اللّه وکەم ئەکات بەتاوان ئەنجام ـدان ( ڕەدە بۆ خەواریج کە پێیان وایە مرۆڤ بە مەعسیەت ئیمان ـی ئەسڕێتەوە )

**بەڵگە لەسەر زیادکردنی ئیمان**

قال تعالی

﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾ [آل عِمۡرَان : ١٧٣]

ئەو هاوەڵانەی وا خەڵکانێــک پێیگوتن: بێگومان ئەو خەڵکانە بۆ لە ناوبردنی ئێوە هەموو کۆبوونەتەوە وئەیانەوێ لە ناوتان بەرن ، ئەشێ بترسن و خۆتان تووش نەکەن، کەچی بەهەرەشەی ئەوخەڵکە ئیمــانیان بەهێزتربوو ئەیانگوت ﴿ وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾ [آل عِمْرَان : ١٧٣]

وە لەفەرموودەکەی ابن مسعود هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لە باسی پلە بەرزی ونزمیەکان ـی ئیمان فەرموویەتی

[ فمن جاهدهم بيده فهو مؤمن ومن جاهدهم بلسانه فهو مؤمن ومن جاهدهم بقلبه فهو مؤمن وليس وراء ذلك من الإيمان حبة خردل ]

هەرکەس جیهادیان لەدژبکات بەدەست ئەوە ئیمانداره وە هەرکەس بەزمان جیهادیان لەدژ بکات ئیمانداره وەهەرکەس بەدڵ جیهادیان لەدژ بکات ئیمانداره لەپاش ئەمە بەئەندازەی گەردیلەیەکـ ئیمان نیە. ( رواه مسلم69/1 )

ـوە ـدەفەرموویت ( من رأى منكم منكراً فليغيره بيده فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان )

هەرکەس لەئێوە خراپەیەکی بینی بابەدەست ـی بیگۆڕێت ئەگەر لەتواناییدا نەبوو بەزمان بیگۆڕێت ئەگەر لەتوانای نەبوو بەدڵ ئینکاری بکات #ئەمەش لاوازترینی ئیمانە(بەڵگەی نزمبونەوەی ئیمانە)

رواه مسلم من حديث أبي سعيد الخدري رضي الله عنه رقم 49

هاوەڵی بەڕێز ابن مسعود ئەیفەرموو

**اجلسوا بنا نزداد إيمانا**

وەرن دانیشین ئیمانمان زیادبـکەین ( البيهقي في شعب الإيمان ج ١ ص ١٧٣ )

---

پاشان ئیمام ـی سوفیان ئەفەرموێت ( **وَلَا يَجُوزُ الْقَوْلُ إِلَّا بِالْعَمَلِ ، وَلَا يَجُوزُ الْقَوْلُ وَالْعَمَلُ إِلَّا بِالنِّيَّةِ** )

واتە دروست نییە تا کرداری لەگەڵ نەبێت وەکردار و وتە دروست نییە هەتاکو نیەت وبڕوای دڵی لەگەڵ نەبێت.

واتا دیسان لەبەر گرنگی پێگەی کردار و وتە و دڵ جەخت دەکاتە وەلەم بابەتە

الإمام الحميدي( 219هـ) رحمــه اللّه ـدەفەرمووێت :

(**وأخبرت أن قوما يقولون: إن من أقر بالصلاة والزكاة والصوم والحج ولم يفعل من ذلك شيئا حتى يموت، أو يصلي مسند ظهره مستدبر القبلة حتى يموت، فهو مؤمن ما لم يكن جاحدا، إذا علم أن تركه ذلك في إيمانه، إذا كان يقر الفروض واستقبال القبلة. فقلت: هذا الكفر باللّه الصراح، وخلاف كتاب اللّه وسنة رسوله ﷺ وفعل المسلمين، قال اللّه عز وجل :**

﴿ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾ [البَيِّنَة : ٥]

هەوالـم پێدراوە کەکەسـانێ ئەڵێن هەرکەسێ دان بنێت بەنوێژ و زەکات و ڕۆژوو وحەج بەڵام هیچ ـی ئەنجام نەدات تائەو ڕۆژەی دەمرێت یان نوێژبکات وپشـت لەقیبلە بکات تادەمرێت ئەوکارە بکات بەڵام نکوڵی نەکات لەفەرمانەکانی اللّه بەدڵ وبەزمان ئەوا ئیـمانداره (ئیمام الحمیدی ئەفەرموویێت ) منیش ئەڵێم ئەم وتەیـە کوفرێکی ئاشـکرایە وپێچەوانە قورئان وسونەتی پێغەمـبەر ﷺ وکرداری موسڵمانانە قال اللّه عزوجل ﴿ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾ [البَيِّنَة : ٥]

فەرمانیان پێکـرابوو نوێژبکەن و زەکات دەربـکەن وە هەر ئەوە ئایینی پایەدارو ڕاست ودروست وپتەوە.

**( قال حنبل: قال أبو عبداللّه أو سمعته يقول: من قال هذا فقد كفر باللّه ورد على اللّه أمره وعلى الرسول ما جاء به )**

حنبل دەفەرموویێت ابو عبداللّه فەرمووی یان بیستم دەیفەرموو هەرکەسێ ئەو قسەیە بکات(بڵێت وازهێنان لەکردار زیـان لەئیمان نادات وخاوەنەکەی هەرموسڵمانە ) ئەوا خاوەن ئەو وتەیە کوفری بەاللّه کردووە و فەرمانی اللّه ورسولەکەی ﷺ ـی ڕەد کردۆتەوە لەوەی پێی هاتووە .

(رواه الخلال في ((السنة)) (3/ 586)، ورواه اللالكائي في ((شرح أصول اعتقاد أهل السنة)) (5/ 887)).

شيخ الإسلام ابن تيمية رحمـه اللّه ـدەفەرموویێت :

**( وأيضا فإن الإيمان عند أهل السنة والجماعة قول وعمل، كما دل عليه الكتاب والسنة وأجمع عليه السلف،..فالقول تصديق الرسول، والعمل تصديق القول، فإذا خلا العبد عن العمل بالكلية لم يكن مؤمنا )** .

بەهەمان شێوە بــڕواهێنان لەلای ئەهلی سونەت وجەماعە وتە وكـــــرداره هەروەک قورئان وسونەت و ئیجماعی سەلەف بەڵگەن لەسەر ئەمە جا وتــە بریتییە لە بەڕاســتدانی پێغەمــبەر ﷺ لەوەی پێی هاتووە وە كـــــردار بریتییە لە بەڕاستخستنەوەی دانپێدانانی زمـــــان ( واتا گەر كەسێ بڵێت بڕوام بە شەرعی اللّە هەیە وبەڵام ڕەدی بكاتەوە كرداری پێ بـكات ئەوا درۆدەكات لەوتنی باوەڕهێنان بەحوكمی اللّە ) جاگــەر بەندە دووربــوو لەكرداركردن بەگــشتی ئەوا ئیمــاندار نیە (وەک وازهێنان لەحوكمێكی اللّە بەگشـــتی ) ((شرح العمدة)) (2/ 86).

ئیمــام أبو طالب المكي( 386هـ) رحمـه اللّە ـدەفەرمووێت :

( **وأيضا: فإن الأمة مجمعة أن العبد لو آمن بجميع ما ذكرناه من عقود القلب في حديث جبريل عليه السلام من وصف الإيمان، ولم يعمل بما ذكرناه من وصف الإسلام بأعمال الجوارح، لا يسمى مؤمنا، وأنه إن عمل بجميع ما وصف به الإسلام ثم لم يعتقد ما وصفه من الإيمان، أنه لا يكون مسلما. وقد أخبر صلى اللّە عليه وسلم أن الأمة لا تجتمع على ضلالة** ) (((قوت القلوب)) (2/ 253)).

بەهەمان شێوە ئـومەت كۆدەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر بــەندەیەک باوەڕبهێنێت بەهەموو ئەوەی باسمــان كرد لەبیروڕاكانی دڵ وەک لەفەرموودەكەی جــبریل علیه السلام هاتوە كەوەسفی ئــیمانی كرد بەوەی ئیمان بریتیە (لەباوەڕهێنان بەاللّە و پێغەمبەرەكانی وفریشتەكانی و كتێبەكانی اللّە و ڕۆژی دوای و قەدەر ) جاگــەر كەسێ كرداری لاشــە نەكــات بەوانەی باسكران لەوەسفەكانی ئیســلام ئەوا ئەوكەسە ناونانرێت بەباوەڕدار ، بەپێچەوانەشەوە گەر كردار بكات بەهەموو وەسفەكانی ئیســلام بەڵام باوەڕی نەبـێت بەوەسفەكانی ئیمــان ئەوا موســڵمان نیە وە پێغەمــبەر ﷺ هەواڵیداوە ئومەتەكەی لەسەر گومڕایی كۆنابێتەوە .

الإمام المجدد محمد بن عبد الوهاب رحمـه اللّه ـدەفەرمووێت :

**( لا خلاف بين الأمة أن التوحيد: لابد أن يكون بالقلب، الذي هو العلم؛ واللسان الذي هو القول، والعمل الذي هو تنفيذ الأوامر والنواهي، فإن أخل بشيء من هذا، لم يكن الرجل مسلما**

خیلاف نییـە لە نێوان ئومەتدا كە تەوحیـــد پێویستە لە دڵ هەبێت كە بریتییە لە زانســت بوون وە بە زمان دانی پێدابنێت كەبریتییە لەوتە وە كرداری پێ بــكات كە بریتییە لەجێ بەجێكردنی فەرمان ونەهیەكان جا ئـــەگەر یەكێ لەم سێ خاڵە نەبێت لە بەندەیەكدا ئەوا ئەو كەسـە موســـــــڵمان نـــیـیـــــــــە

**فإن أقر بالتوحيد، ولم يعمل به، فهو كافر معاند، كفرعون وإبليس. وإن عمل بالتوحيد ظاهراً، وهو لا يعتقده باطناً، فهو منافق خالصاً، أشر من الكافر واللّه أعلم)**

جاگـەر دان بنێت بەتەوحیـــد وكرداری پێ نەكـــات (وەك عەلمـانیە مونافیقەكان) ئـــەوا كـــافرێكـی عینادە وەک فیرعەون و ابلیس وە ئەگەر بەڕووكەش كردار بەتەوحیـد بكات بەڵام لەدڵەوە باوەڕی پێی نەبێت ئەوا مونافقێكـی تەواوە خراپترە لەكافری ئەصڵی اللّە ـش زاناترە . ((الدرر السنية في الأجوبة النجدية)) (2/ 124)).

ئیمام سـفیان ـی ثوری رحمه الله فەرمووی

( وَلَا يَجُوزُ الْقَوْلُ وَالْعَمَلُ وَالنِّيَّةُ إِلَّا بِمُوَافَقَةِ السُّنَّةِ ) .

وته وکردار دروست نییه تا موافق ـی سونەت نەبێت .

واته مەرج ـی قبوڵ بونی عیبادەت دووخاڵە

① نیەتت بۆ اللّه تعالی بێت .

② ئەو عیبادەتە لەسەر سونەت پێغەمبەر ﷺ بێت بەوشێوە ئەنجام ـی بەیت کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجام ـی داوە .

بەڵگە لەسەر مەرج ـی یەکەم

قال اللّه تعالی ﴿ قُلۡ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ دِينٗا قِيَمٗا مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٦١ قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾

[الأَنْعَام : ١٦١ - ١٦٢]

پێیان بـڵێ نوێژخوێندن و سەربڕین ـی ئاژەڵ وژین ومردنم هەرهەمووی بـۆاللّه یە وەبەمە فەرمانم پێکراوە ومن یەکەمین موسڵمانم .

وقَالَ تَعَالَى: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ﴾ [البَيِّنَة : ٥]

فەرمانیان پێنەکرابـوو تەنها بەوە نەبێت کەاللّه بپەرستن بە ئیخلاص ونیەت پاکی بۆ اللّه تعالی نەبێت وە خۆیان لابدەن لە هەموو شیرکـ وکوفرێک .

وقال تعالى ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ [المُلْك : ٢]

اللّه ئەو زاتەیە مردن وژیان ـی دروستکردووە تاتاقیتان بکاتەوە کەکێ باشترین کار ئەنجام ئەیات .

ئیمام ـی فضیل بن عیاض فەرمووی ( **هو أخلصه وأصوبه**) .

کرداری باش واتا ئەوەی بە ئیخڵاص وصەواب ـەوە ئەکرێت

وتیان ئەی باوکـی عەلی ( **ما أخلصه وأصوبه**؟ )

ئیخڵاص وصەواب بێت چییە ؟

فەرمووی ( **إن العمل إذا كان خالصًا ولم يكن صوابًا لم يقبل، وإذا كان صوابًا ولم يكن خالصًا لم يقبل، حتى يكون خالصًا صوابًا، والخالص أن يكون للّه، والصواب أن يكون على السنة، ثم قرأ قوله تعالى:** ﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ [الكَهْف : ١١٠]

کردار ئەگەر نیەتت بۆ اللّه بێت بەڵام صەواب نەبێت قەبوڵ ناکرێت وە ئەگەر صەواب بێت ونیەتت اللّه نەبێت دیسان قبوڵ ناکرێت تا ئیخڵاص وصەواب ئەبێت پێکەوە وە ئیخڵاص ئەوەیە نیەتت تەنها بـۆ اللّه بێت وە صەوابیش ئەوەیە لەسەر سونەت بێت پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ( هەرکەس ئەیەوێ بگات بەدیداری پەروەردگاری ئەوا باکرداری چاک بـکات (لەسەرسونەت) وەلەپەرستنداهاوبەش بۆ اللّه دانەنێت (نیەت ـی تەنها بۆ اللّه بێت ) .

ئیمام ـی عُمَر وـی کوڕی خَطَّابِ رضي اللهعنه ـدەفەرموێت بیستم لە رَسُولَ اللّهِ ﷺ ئەیفەرموو « **إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ** » مُتْفَقٌ عَلَيهِ.

کردارەکان بەپێی نیەتەکانە وە هەرکەسێ نیەتی هەر شتێکی هەبێت ئەوەی بۆهەیە جاهەرکەسێ هیجرەت ـی کردبێت لەپێناو بەدەست هێنانی دوونیا یان بۆئەوەی زواج لەگەڵ ئافرەتێ بکات ئەوا هیجرەتەکەی بۆ ئەوشتەیە (ولای اللّه پاداشت ـی بۆنیە).

ئیمام ـی مسلم ئەیگێڕێتەوە کەوا رَسُولُ اللّهِ ﷺ فەرموویەتی :

« **قَالَ اللّه تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلًا أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ** ».

اللّه تعالی فەرموویەتی من بێ پێویستم لە هاوبەش هەرکەسێ کردارێ بکات وجگە لەمن بەشی کەسێ تری تێ بخات ئەوا کردارەکە و هاوبەشەکەشی واز لێ دێنم (واتە کردارەکەی لێ قەبوڵ ناکەم وەتاوانبارە چونکە شەریکی ـداناوە بۆ اللّه تعالی).

ئیمام ـی احمد لە محمود بن لبيد الأنصاري رضي اللّه عنه ئەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( ئەوشتەی زۆر ئەترسم لەوەی توشی ببن ) **إن أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر، الرياء**، (شیرکی بچوکە ڕیایی کردن [چاکەکردن بەنیەت ـی ئەوەی خەڵک وەسفی بکات ) **يقول اللّه عز جل إذا جزى الناس بأعمالهم: اذهبوا إلى الذين كنتم تراؤون في الدنيا، فانظروا هل تجدون عندهم جزاء؟** ) اللّه عزوجل ئەفەرموێت کاتێ لەقیامەت پاداشتی خەڵکی ئەیاتەوە بڕۆن بۆلای ئەوانەی لەدوونیادا ڕیایتان بۆ ئەکردن بڕۆن سەیرکەن بزانن ئایا ئەتوانن پاداشتان بەنەوە ؟! ( رواه أحمد ) .

## چی کاتێ ڕیـا ئەبێتە شیرکی گەورە؟

① ئەگەر بەکردنی عیبادەتێ لە ئەسڵەوە نیەتـی بۆ اللّه نەبێت مەبەستی بەرچاوی کردن بێت لەلای خەڵکـ ئەوا موشریکە وکافرە وەکـ موونافیقەکان.

اللّه تعالی لە وەسفی موونافیقەکان ـدەفەرموویێت

﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ [النِّسَاء : ١٤٢]

دووڕووەکان بەگومانی خۆیان اللّه هەڵئەخەڵەتێنن بەڵام اللّه ئەوان هەڵئەخەڵەتێنێ وەکاتێ هەڵئەستن بۆنوێژ بەتەمبەڵیەوە بۆی ئەچن وە بەرچاوی بۆخەڵکی ئەکەن و کەمێـک نەبێت یادی اللّه تعالی ناکەن.

② جۆری دووەم کەئەبێتە شـیرکی بچوک ئەوەیە لەئەسڵدا بەنیەت ـی اللّه ئەنجام ـی ئەیات بەڵام لەناو عیبادەتەکەدا لەبەر ئەوەی کەسێ سەیری ئەکات عیبادەتەکە جوانتر ئەکات ئەمە شیرکی بچوکە چونکە لەگەڵ نیەت بونی بۆ اللّه لەبەر بینینی خەڵکێ تر عیبادەتەکە جوانتر ئەنجام ئەیات.

دووەم مەرج ـی قبوڵ بونی عیبادەت ئەوەیە لەسەر سونەت بێت

## سوننەت چیە ؟

هەرشـتێک ـدرابێتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ لە گوفتار ولەکردار یان هەرشتێ ئەنجام درابێت پێغەمبەر ﷺ ئیقراڕی پێکردبێت بەمە ئەوترێ سونەت .

واتا هەر عیبادەتیٚ ویستت ئەنجام بدەیت قبوڵ نییە تا ئیخڵاص ولەسەر سونەت نەبێت کەواتە مەرجە هەرعیبادەتیٚ دەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجام ـی دابێت وە دەبێت بەو شێوەیەش ئەنجام ـی بەیت کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجام ـی داوە .

رَسُولُ اللّهِّ ﷺ ـدەفەرمووێت : (**صلوا كما رأيتموني أصلي**) رواه البخاری

نوێژ بــکەن بەوشێوەیەی من ئەنجام ـی ئەیەم . کەواتە مەرجە عیبادەت لەسەر شێوازی پێغەمبەر ﷺ بکرێت .

ـوە دەفەرمووێت :

( **مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ** ) رواه البخاري فتح رقم (2697)

هەرکــەسیٚ شـتیٚ داهێنێت لەدیـــنەکەمان لەکاتێکدا لەدین نەهاتبێت ئەو کردەوەیە ڕەد ئــەکرێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

" **إنــي قـد تركتـكم عـلى مثـل البيضـاء ليـلهـا كنهارها لا يزيغ عنها بعدى إلا هالك** "

أخرجه احمد

بەڕاستی و بیٚ گومان من لەسەر ڕۆشناییەك ئێوەم جیٚ هێشتووە، شەوی وەك ڕۆژی وەهایە، هەرکەسێك دوای من لێی لابدات، بێگومان تیاچووە.

**وە فەرموویەتی ﷺ :**

**" من عمل عملاً ليس عليه امرنا فهو رد " أخرجه مسلم.**

**هەر کەسێك کردەوەیەك بکات بەدین و فەرمانی ئەم دینەی ئێمەی لەسەر نەبێت، ئەوا لێی وەرناگیرێت وڕەدئەکرێتەوە.**

**وە هەرشتێ پێغەمبەر ئەنجام ـی نەیابێت تۆ بەناوی دینەوە ئەنجام ـی بەیت ئەوا بیدعەت کردووە ، بیدعە لەدیـندا بەو شتە دەوترێت کە کەسێکـ ڕێگایەکـ دادەنێت بەمەبەستی نزیکـ بوونەوە لە اللە تعالـی لەکاتـێکدا قورئان وسونەت ئەو ڕێگایەی دانەناوە بۆ دینداری کـردن ، چونکـە قاعیدەیەکی شـەرع ـی هەیە (ئەصـڵ لەشەرع ـدا ئەوەیە هیچ جۆرە پەرستنێ ئەنجام نەدرێت ئەگەر لەقورئان وسونەت بەڵگەی لەسەر نەهاتبێت )**

**بەڵام بۆکاروباری دونیا (ئەصڵ وایە حەڵاڵە تـا بەڵگەیەکـ لەقورئان وسونەت یان ئیجماع یان قیاس هاتبێت بەحەرام کردنی)**

**ئەهلی بـیدەع کاروباری دونیا ودینیان تێکەڵ کردوە وادەزانن بۆیان هەیە بەناوی دیـنەوە یاسا دابنێن وبیکەن بەخێر وعیبادەت بۆخەڵکـی**

**بۆنمـونە فەرمانمان پێکراوە زیکری اللە بکەین لە سونەت ـدا بۆمان ڕونکراوەتەوە بە سەرە پەنجەکانمـان زیکر بکەین ، ئەهلی بـیدەع دێن دەڵێن بەتەسـبیح زیکر بکەن ئەوەش خێرە ئەمە پیی دەوترێ بیدعەی اضافی واتە زیکرەکە لەشەرع ـدا ئەسڵی هەیە بەڵام ئەمان چۆنیەتیەکیان بۆزیاد کـردوە کەلەشەرع ـدا نەهاتووە .**

یان بۆنمونە ئاهەنگێڕان بەیادی لەدایکبونی پێغەمبەر ﷺ هیچ بەڵگەیەک لەقورئان وسونەت نەهاتوە ڕۆژی لەدایکبونی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم تایبەت بکات بۆ ئەهانگێڕان و شرینی بەخشین ..هتد

بەڵام دەبینیت ئەهلی بیدەع ئاهەنگێڕانیان کردوە بە دین وخێر لە کاتێکدا لە دین نەهاتوە ئەمە پێی دەوترێ بیدعە واتا ئەسڵی نیە لە شەرع ـدا مرۆڤ دایهێناوە خستویەتیە پاڵ دینەوە

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر وتاری دابوایە ئەیفەرموو :

**أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ**.. رواه مسلم رقم (867).

لە پاشان ـدا باشترین وتە کتاب ـی الله یە وباشترین ڕێنمای ڕێنمای محمد ـە ﷺ و خراپترینی کارەکان ئەو شتانەن بەناوی دینەوە دادەهێنرێن و هەموو بیدعەیەک گومڕاییە .

کەواتا هەموو بیدعەیەک گومڕاییە بەدەق ـی فەرموودە

ئەی چی شتێ پێی دەوترێ بیدعە

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ـدەفەرمووێت :

( **مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ** ) رواه البخاري فتح رقم (2697)

هەرکەسێ شتێ داهێنێت لە دینەکەمان لەکاتێکدا لە دین نەهاتبێت ئەو کردەوەیە ڕەد ئەکرێتەوە.

قـال اللّه تعالى:

﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾

[المَائـِدَة : ٣]

ئەمڕۆ دینەکەتـانم بۆ کامڵ کـردن و نیعمەتی خۆم ڕشـت بەسەرتاندا بەتەواوی وە ڕازیش بووم بەوەی ئیسـلام دین وڕێبازتان بێت .

کەواتـا دین کامڵ بووە هەرکەسێ شتێ بۆ دین زیادبـکات ئەوە خۆی کردۆتە شەریـکی اللّه وشەرع ـی داناوە .

ئیمام ـی الشاطبي لـە الاعتصام ت (ج1/ص64- 65) ـدەفەرموێـت

قال ابن الماجشون: **سمعت مالكاً يقول: من ابتدع في الإسلام بدعة يراها حسنة، زعم أن محمداً ﷺ خان الرسالة، لأن اللّه يقول:** ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴾ [المَائـِدَة : ٣] **فما لم يكن يومئذ دينا، فلا يكون اليوم دينًا**.

ابن مـاجشون دەفەرموێ بـیستم لە مالـک دەیفەرموو هەرکەسێ بیدعەیەکـ دابنێت و پێی وابێت بیدعەیەکی چاکـە ئەوە گومانی وایە محمـد ﷺ ناپاکی کردوە لەگەیاندنی دینی اللّه چونکە اللّه ـدەفەرمووێت ( ئەمڕۆ دینەکەم بۆکامڵ کردن ) هەرشـتێ لەو ڕۆژەدا دین نەبوبێت ئەمڕۆ نابـێت بەدین .

ئیمـام ـی شافع ـی رحمە اللّه ـدەفەرمووێت

"**من استحسن فقد شرع**" المستصفى 247

هەرکـەسێ بڵێت ئەم بیدعەیە چـاکە ئەوە شەرع ـی داناوە

## شەرع ـدانان چیە ؟

اللّە ـدەفەرمووێت :

﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ﴾ [الشُّورَى : ٢١]

ئاخۆ ئـەوانە چەند هاوبەشێک بۆ اللّە دادەنێن بەوەی چەند یاساو بەرنامەیەکیان بۆ داهێنابن لە ئایین کە بە هیچ شێوەیەکـ اللّە مۆڵەتی نەدابن وشـتی وای نەفەرمووە .

ئیمام ـی عبداللّە بن عبدالرحمن الدارمي رحمە اللّە لە "سننەکەیـدا" (210) دەیگێڕێـتەوە کە ئەبو موسـای ئەشـعەری ڕەزای اللّە لـێ بێت هاو بۆ لای ابن مسعود بە ابن مسعودی فەرموو ئەی ابو عبدالرحمـن من شتێکم بینی لە مزگەوت بە خراپـم زانـی والحمدللّە بەخێرم نەزانـی

ابن مسعود فەرمووی ئەوشتە چی بوو ؟

فەرمووی ئەگەر بژێیت دەیبینیت ، کەسـانێکم بینی لە مزگەوت کۆمەڵ کۆمەڵ چاوەڕێی نوێژیان دەکـرد هەر کۆمەڵێکیان کەسـێ بەسەریانەوە بوو وە هەموویان بـەردی بچووک بچووکیان بەدەستەوە بوو ، ئەو کەسەی بەسـەریانەوە بـوو بەکۆمەڵەکەی خۆی دەوت

سەد جار اللّە اکبر بـکەن ئەوانیش سەدجار اللّە اکبریان دەکرد (بەبەردەکان دەیان ژمارد) دەیگوت سـەد جار لا الە الا اللّە بکەن ئەوانیش دەیانکرد دەیگوت سەد جار سـبحان اللّە بکەن ئەوانیش سەد جار سبحان اللّە یان دەکرد

ابن مـسعود فەرموی ئەی تۆ چیـت پێیان وت؟

ئەبو موسا فەرمووی هیچ ـم نەوت چاوەڕێی بــۆچوون وفەرمان ـی تۆم

ابن مسعود فەرمووی بۆپێیانت نەگوت کە تاوانەکانیان بژمێرن من زەمانەتی ئەوەیان بۆ دەکەم چاکەکانیان نافــەوتیٚ

پــاشان گەشــتینە مزگەوت

ابن مسعود چوە ســەر کۆمەڵیٚ لەو کۆمەڵانەی نا ومزگەوت ولەسەریـان ڕاوەستا وپێیانی فەرموو ئەمــە چی دەکەن؟

وتیان ئەی باوکی عبــدالرحمن بەردە اللّه اکبرٍ و سبحان اللّه ولااله الااللّه ـی پێدەژمێرین

ابن مسعود پێیانی فەرمــوو

ئێوە خراپەکــانتان بژمێرن من زەمانەتی ئەوەدەکەم چاکەکانتان نافەوتیٚ

هــــــاوار بــــۆ ئێوە ئومەتــی محمد چەند خـــــێرا تیاچوون ئەوەتـا هێشتا هاوەڵانی پێغــەمبەر ﷺ ماون لەناوتاندا ئەوە جلەکانی پێغەمبەر ﷺ هێشتا نەڕزیوە قاپ وقاچەغەکانی نەشکاوە ، ســا سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە یان ئەوەیە ئێوە لەسـەر ڕێگایەکی باشترن لەڕێــگەی پێغەمبەر ﷺ یـان ئەوەیە دەرگای گومڕایی بەڕووی ئومەت دەکەنەوە

وتیــان ئەی ابو عبدالرحمن بەاللّه نیەتمان تەنها خـــــــێرە

ابن مســعود لەوەڵامیـاندا فەرمووی

چەندان کەس هەیە نیەتی خێرە بەڵام پێی ناگــات

پێغەمـبەر ﷺ پێیمانی فەرموو گەلێک پـەیدا دەبن قورئان دەخوێنن لەگەروویان تێناپەڕێ واللّە لەوانەیە زۆربەی ئەوگەلە لەئێوە بـن پاشان ابن مسعود ڕۆشت .

عەمر بن سەلەمە دەفەرمووێ لەڕۆژی جەنگی نەهروان بینیمان ئەم کەسانە لەڕیزی خەواریجەکانەوە شەڕیان دەکرد وتیریان تێدەگرتین .

سـوودەکـان

① مەرج نییە ئەوەی نیەتی خێربێت خێری بۆبنوسرێت تا کردەوەکەی سەد لەسەد لەسەر سونەت نەبێت

② وتنی اللّە اکبر ولاالە الااللّە وسبحان اللّە لەسونەت ـدا هاتوە وخێریشە بەڵام وتنی بەتەسبیح و ئامێری ژماردن لە سونەت نەهاتووە بـۆیە دەیـکات بەبیدعە وگومڕای لەبڕی خێر تاوانت بـۆ دەنوسـرێ

③ ئەدەب ـی هاوەڵان

ابو موسـا زانی کاری ئەو کەسـانەیە هەڵەیە بەڵام زانی ابن مسعود لەو زاناترە چاوەڕێی فەتوای لە ابن مسعود کـرد

④ هەموو بیدعەیەکی بـچوک سەردەکێشێ بۆ بیدعەی ، گەورەتر ئەم کـەسانە لە ژماردنی زیکرەوە بـون بە خەواریج

شُعَيْب فەرمووی وتم بەسوفیـان : " **يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ وَمَا مُوَافَقَةُ السُّنَّةِ؟ قَالَ: " تَقْدِمَةُ الشَّيْخَيْنِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ، يَا شُعَيْبُ لَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتَ حَتَّى تُقَدِّمَ عُثْمَانَ وَعَلِيًّا عَلَى مَنْ بَعْدَهُمَا**

ئەی باوکی عبداللّه موافەقەکردن ـی سونەت چیە ؟ فەرمووی پێش خستنی ئەبو بکر و عمرە ڕەزای اللّه ـیان لێ بێت وە ئەی شوعەیب ئەمەی ئەینوسیت سودت پێ ناگەیەنێت تاوەکــ عوثمان و علی پێش نەخەیت بەسەر هەموو ئەوانەی دواتر.

واتا لە ئصول ـی سونەت کە هەرکەس پێچەوانەی بکات ئەبێتە مبتدع وگومڕا بریتییە لەوەی لە فەزڵدا ئیمام ابوبکر باشترینی ئومەتە پاشان ئیمام ـی عمر ، وە لەخیلافەت ـدا ئەبوبکر شایستەترین کەسی ئومەتە بەوەی خەلیفەی یەکەم بێت پاشان عمر پاشان عثـمان پاشان علی ، هەرکەسێ بڵێت خیلافەت بۆ ئیمام علی لە پێشترە تا ئیمام ـی عثمان ئەوکەسە مبتدع وگومڕایە

عمرو ـی کوڕی العاص رضي اللّه عنه ئەفەرمووێت پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ ( **أي الناس أحب إليك ؟ قال عائشة ، فقلت من الرجال فقال : أبوها ، قلت : ثم من ؟ قال : ثم عمر بن الخطاب** ) رواه البخاري 3662 ، ومسلم 2384

وتم ئەی پێغەمبەر ﷺ کێ خۆشەویسترین کەسـە لای تۆ؟ فەرمووی عائیشە وتم ئەی لەپیاوان ؟ فەرمووی باوکی عائیشە [واتا ئیمام ـی ئەبو بکر] وتم کێی تـر ؟ فەرمووی عمری کوڕی خطاب .

وە لەو بەڵگە سەرِیحەی بەڵگەیە لەسەر فەزڵ ـی ئەبوبکر وباشتربوونی بەسەر هەموو ئومەت ئەوەیە کاتێ پێغەمبەر ﷺ نەخۆش بوو لەکۆتایەکان ـی تەمەنیدا فەرمانی کرد و فەرمووی ( **مروا أبا بكر فليصل بالناس** ) رواه البخاري 683 ، ومسلم 418

بە ئەبـوبکر بڵێن تاپێش نوێژی بۆخەڵکـ بکات [واتا پێغەمبەر ﷺ ئەبوبکری کرد بەجێگری خۆی وکردی بەپێشەوای موسڵمانان ]

أنس ـی کوڕی مالك رضي اللّه عنه ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ سەر ئوحود کەوت کێوی ئوحد هاتە لەرزە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی

( **اثبت أحد فإنما عليك نبي وصديق وشهيدان** ) رواه البخاري 3675

جێگـیربە ئەی ئوحود چونکە پێغەمبەرێـک و صدیقێکـ[ئەبو بکر] وە دو شەهیدت لەسەرە[ئیمام ـی عمر و عثمان] .

أبي سعيد الخدري رضي اللّه عنه ئەیگرێتەوە کە رسول ﷺ فەرمووی :

لەخەونـمدا خەڵکـانم بینی کراسیان لەبەردابوو هەیان بوو کراسەکەی تا لای سنگی بوو هەیان بوو کەمتر وزیاتر بەڵام بینیم کراسەکەی عمری کوڕی خطاب هێندە درێژە بەدوایدا دەخشـا وتیان ئەی پێغەمبەر ﷺ بەچی ئەوە تەفسیر ئەکەی ؟ فەرمووی بەدیـن [واتا دینی ئیمام عمر کامڵ و زۆرترینە]

( **بينا أنا نائم رأيت الناس يعرضون علي وعليهم قمص ، منها ما يبلغ الثدي ومنها ما دون ذلك ، وعرض علي عمر بن الخطاب وعليه قميص يجره ، قالوا فما أولت ذلك يا رسول اللّه قال الدين** ) رواه البخاري 23 ، ومسلم 2390

عبد اللّه بن عمر رضي اللّه عنه ئەفەرموێ بیستم لە ﷺ ئەیفەرموو ( بينا أنا نائم أتيت بقدح لبن فشربت ..ثم أعطيت فضلي عمر بن الخطاب ، قالوا فما أولته يا رسول اللّه قال العلم ) من خەوتبوم لەخەونم ـدا شیریان بۆهێنام وخواردمەوە ..پاشان ئەوشیرەی کەمایەوە یـام بەعمری کوڕی خطاب وتیان بەچی ڕاڤەی ئەکەی ؟ فەرمووی بەعیلم (زانست) . رواه البخاري 82 ، ومسلم 2391

محمد الحنفية -کوڕی ئیمام ـی علی کوڕی ئەبی طالب ئەفەرموویّت :

( **قلت لأبي أي الناس خير بعد رسول اللّه ﷺ ؟ قال : أبو بكر ، قلت ثم من ؟ قال : ثم عمر ، وخشيت أن يقول عثمان ، قلت ثم أنت ؟ قال : ما أنا إلا رجل من المسلمين** )

له بـاوکم پرسی کێ باشترین کەسە له دوای پێغەمبەر ﷺ ، باوکم (علی) فەرمووی باشترین کەس لەدوای پێغەمبەر ﷺ ئەبوبـکرە پاشان عمر . ترسام بڵێت دوای عمر عثـمانە وتم ئەی تۆ ئەی باوکە ؟ وتی من تەنها پیاوێـکم لە موسڵمانان .

( رواه البخاري 3671 )

لەئیمام ـی علي رضي اللّه عنه گێڕدراوەتەو فەرموویەتی " **لا أوتي بأحد يفضلني على أبي بكر وعمر إلا ضربته حد المفتري** "

هیچ کەسێک نیە بیهێنن بۆلام فەزڵ ـی من بدات بەسەر ئەبو بکر و عمر ئیلا حەدی بوهتان ـی لەسەر جێ بەجێ دەکەم (واتا هەشتا جەڵدی لێ دەدەم چونکە بوهتانی کردووە ).

شیخ الإسلام ابن تيمية رحمه اللّه ئەفەرموویّت ( " **وقد تواتر عنه أنه كان يقول على منبر الكوفة خير هذه الأمة بعد نبيها أبو بكر ثم عمر روى ذلك عنه من أكثر من ثمانين وجها ورواه البخاري وغيره ولهذا كانت الشيعة المتقدمون كلهم متفقين على تفضيل أبي بكر وعمر** " )

بەمتواتری لەئیمام ـی علی یەوە هاتوە لەسەر میمبەر لەشاری کوفە فەرموویەتی باشترین کەسی ئومەت لەپاش پێغەمبەر ﷺ ئەبـوبکرە پاشان عمر زیاتر لە هەشتا شێوە لێیگێڕدراوەتەوە وە ئیمام ـی بوخاری وجگە لەبوخاریش ڕیوایەتی کردووە هەربۆیە شیعە کۆنەکان ـی سەرەتا یەکدەنگ بون لەسەر بەباشتر دانانی ئەبو بکر و عمر . منهاج السنة 1 / 308

أبي جحيفة ئەفەرموویت : " **أن عليا رضي اللّه عنه صعد المنبر ، فحمد اللّه تعالى وأثنى عليه وصلى على النبي ﷺ وقال : خير هذه الأمة بعد نبيها أبو بكر ، والثاني عمر رضي اللّه عنه** " .

علی ڕەزای اللّه ـی لێ بێت سەر میمبەر کەوت وسوپاس ـی اللّه ـی کرد وصەڵاوات ـی بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد وپاشان فەرمووی باشترین ـی ئومەت لە پاش پێغەمبەر ﷺ ئەبوبکرە و پاشان عمر ڕەزای اللّه ـی لێ بێت.

رواه الإمام أحمد في مسنده 839 ، وقال شعيب الأرناؤوط : " إسناده قوي "

ئیمام ـی ابن حجر رحمه اللّه ئەفەرموویت :

" **انْعَقَدَ الْإِجْمَاع بِأخِرة بَيْنَ أَهْلِ السُّنَّةِ : أَنَّ تَرْتِيبَهُمْ فِي الْفَضْلِ ، كَتَرْتِيبِهِمْ فِي الْخِلَافَةِ ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَجْمَعِينَ** "

لەدوایدا ئیجماع لەنێوان ئەهلی سوننەت دامەزرا کەپلەبەندی ئەو چوار صحابەیە وەک پلەبەندیانە لەخیلافەت ـدا (واتا چۆن لەخیلافەت ابو بکر پاشان عمر پاشان عثمان پاشان علی یە بەهەمان شێوە لەفەزڵ وچاکیشدا بەهەمان شێوەیە)

" فتح الباري " (7/ 34) .

وە ـدەفەرموویت

" **نَقَلَ الْبَيْهَقِيُّ فِي الِاعْتِقَادِ عَنِ الشَّافِعِيِّ أَنَّهُ قَالَ: أَجْمَعَ الصَّحَابَةُ وَأَتْبَاعُهُمْ عَلَى أَفْضَلِيَّةِ أَبِي بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرَ ثُمَّ عُثْمَانَ ثُمَّ عَلِيّ** "

بەیهەقی نەقڵـی کردوە لەاعتقاد لە شافعی یەوە کەفەرموویەت ـی هاوەڵان وشوێنکەوتوان یەکدەنگن لەسەر بەباش دانان ـی ئەبوبکر پاشان عمر پاشان عثمان پاشان علی . فتح الباري " (7/ 17)

ئیمام ـی الدارقطني رحمه الله ئەفەرموویێت :

**" عثمانُ بنُ عفَّانَ أفضلُ من عليِّ بنِ أبي طالبٍ ، باتِّفاقِ جماعةِ أصحابِ رسولِ اللّهِ ﷺ ، هذا قولُ أهلِ السنةِ "**

ئیمام ـی عثمان ـی کوڕی عفان باشترە لە علی کوڕی ابی طالب بەیەکدەنگی صحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەمەش وتەی ئەهلی سـونەتە .

" سؤالات السلمي للدارقطني " (ص 238) .

شیخ ـی الاسلام ابن تیمیة رحمه الله ئەفەرموویێت :

**" اسْتَقَرَّ أَمْرُ أَهْلِ السُّنَّةِ عَلَى: تَقْدِيمِ عُثْمَانَ ، ثُمَّ عَلِيٍّ "**

وتەی ئەهلی سـونەت لەسەر ئەوە جێگیربوە کەئیمام عثمان وەکچۆن لەخیلافەت لەپێشترە بەهەمان شێوە لەفەزڵیشدا پێش ئیمام علی ئەخرێت .

" العقيدة الواسطية " (ص 117) .

بەڵام هەرکەسـێ پێی وابێت ئیمام عثمان لە خیلافەت پێشترە تاوەک ئیمام علی بەڵام پێی وابێت لە فەزڵدا ئیمام علی باشترە ئەمە هەڵەی کردووە وموخالەفەی جمهوری ئەهلی سونەت ـی کردووە هەندێ لەزانایان بەوە تبدیع ـی ئەکەن وهەندێکیش تەنها بەهەڵەی ئەزانن وتبدیع ـی ناکەن .

إسحاق بن إبراهیم دەڵێت پرسیارم لە ئیمام احمد کـرد ( **عمن قدم عليا على عثمان فقال هذا رجل سوء** )

کەسـێ علی پێش ئیمام عثمان بخات فەرمووی ئەوەی وابکات کەسێکی خراپە

صالح بن أحمد بن حنبل ئەفەرموویێت ( **سئل أبي وأنا أسمع عن من يقدم عليا على عثمان مبتدع قال هذا أهل أن يبدع أصحاب النبي ﷺ قدموا عثمان** )

پرسیار لە باوکــم کرا و گوێم لێ بوو لەبارەی کەسێک کە علی پێش ئیمام عثمان بخات ئایا ئەوکەسە تبدیع ئەکرێ ؟ باوکم فەرمووی شایستەیە تبديع بكرێت چونكە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئیمام عثمانیان پێش علی خستووە . [السنة للخلال: 380/2]

بەڵام شیخ الإسلام ابن تیمیة ئەفەرموویێت :

" **هَذِهِ الْمَسْأَلَةُ - مَسْأَلَةُ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ - لَيْسَتْ مِنَ الْأُصُولِ الَّتِي يُضَلَّلُ الْمُخَالِفُ فِيهَا عِنْدَ جُمْهُورِ أَهْلِ السُّنَّة ، لَكِنَّ الْمَسْأَلَةَ الَّتِي يُضَلَّلُ الْمُخَالِفُ فِيهَا: مَسْأَلَةُ الْخِلَافَةِ** " .

بابەت ـی پێشخستنی عثمان وعلی لەئصول نیە تا موخالف بەگومڕا دابنرێت لەلای جمهوری ئەهلی سونەت بەڵام ئەوەی کەبەگومڕا دادەنرێت ئەوکەسەیە لەبابەتی خیلافەت علی پێش عثمان بخات . " العقيدة الواسطية " (ص 118) .

---

ئیمام ـی سوفیان بە شوعەیب ئەفەرموێ

**يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ لَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتُ لَكَ حَتَّى لَا تَشْهَدَ لِأَحَدٍ بِجَنَّةٍ وَلَا نَارٍ إِلَّا لِلْعَشَرَةِ الَّذِينَ شَهِدَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ وَكُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ**

ئەی شوعەیب سودت پێ ناگەیەنێت ئەوەی بۆم نوسیت تاوەکــو شاهێدی نەیەی بەبەهەشت و بەدۆزەخ بۆ هیچ کەسێ تەنها ئەو دەکەسە نەبێت کە پێغەمبەر ﷺ شاهێدی بەهەشت ـی بۆ داون و هەر دەکەسەکە لە قورەیشن .

## شـــاهێدی ـدان بە بەهەشت ـی بوون وبەدۆزەخ ـی بوون دوو بـەشە

بەشـی یەکەم / بەشێوەی گشتی بەبەڵگەی قورئان وسونەت بڵێیت هەرکەسێ ئەم کارە بکات ئەوا ئەچێتە دۆزەخەوە [ئەمەیان ترسـاندن ـە بەشێوەی عام جائیزە بۆ نموونە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ ئەوپیاوەی پۆشاکەکەی لەخوار قولەپێیەکانیەوە بێت لەئاگردایە ] ئەمە بەشێوەی گـشتی جائیزە بوترێ ، یان بڵێیت هەرکەسێ بەئیمان و چاوەڕوانی پاداشتەوە ڕۆژوو بگرێت یان زەکات بات ئەچێتە بەهەشتەوە ئەمـە بەم شێوە دروستە.

بـەشـی دووەم /شاهێدی ـدانە بۆشەخسێک بەدیاریکراوی واتە بۆنمونە کەسێ ئەبینیت ئارەق ئەخواتەوە ولەسەر ئارەق ئەمرێت بۆت نیە بڵێی ئەمە اللّه لێی خۆشنابێت وئەچێتە دۆزەخەوە .

پێغەمبەر ﷺ باسی پیاوێکی بەنی اسرائیل ئەکات وئەفەرمووێت

**ان رَجُلًا قالَ: واللَّهِ لا يَغْفِرُ اللَّهُ لِفُلانٍ، وإنَّ اللَّهَ تَعالَى قالَ: مَن ذا الذي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أنْ لا أغْفِرَ لِفُلانٍ، فإنِّي قدْ غَفَرْتُ لِفُلانٍ، وأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ،**

پیاوێـک ووتی واللّه ـی اللّه لە فڵانەکەس خۆشنابێت وە اللّه تعالی فەرمووی ئەو کەسە کێیە کە بە ناوی من سوێند ئەخوات وبڕیار ئەدات ئەوا من لەفڵان کەس خۆش بووم وکردەوەکانی تۆشـم پوچەڵکردەوە. صحيح مسلم: 2621

**پرســیار ئایا کەسێ لەسەر شـیرکی گەورەی دەرخەر لە ئیسلام بمرێت ئەتوانین بڵێین ئەو کەسە لە دۆزەخ ـدایە ؟**

**وەڵام ـ ئەمەش دوو بەشە**

**یەکەم / کەسێ شەریکی بۆاللّه ـداناوە ولەسەر شیرک مردوە بەڵام پەیام ـی اللّه ـی پێ نەگەیشتوە وە هیچ بانگەوازی تەوحیدی پێ نەگەیشتوە وەهیچ هۆکارێـکی دەست نەکەوتوە بگەڕێت بەدوای فێربونی تەوحید ئەمـ کەسـە لەدوونیادا موشـریکە چونکە هاوبەشی بۆاللّه ـداناوە بەڵام لەقیامەت ـدا تاقـی ئەکرێتەوە ئەگەر لەو تاقیکردنەوەی دەربازبێت ئەوا بۆ بەهەشتە و ئەگەریش دەرباز نەبێت بۆ دۆزەخ ـە ، کەواتـا ئەم جۆرە خەڵکـە حوکم لەسەر قیامەتیان بەدیاریکراوی نادرێت.**

**پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموویێت :**

**( أربعةٌ يحتجون يومَ القيامةِ : رجلٌ أصمٌّ لا يسمعُ شيئًا . ورجلٌ أحمقُ ، ورجلٌ هرِمٌ ، ورجلٌ مات في فترةٍ . .. فيأخذ مواثيقَهم ليطيعنَه ، فيُرْسَلُ إليهم : أنِ ادخلوا النارَ ، فمن دخلها كانتْ عليه بردًا و سلامًا ، و من لم يدخلْها سُحِبَ إليها )**

**چوار کەس لە قیامەت ـدا تاقی ئەکرێنەوە پیاوێـکی کەڕ کەبیستنی لەدەستداوە وە پیاوێ کەئەقـڵی نیە (شێت) وە پیرەمێردێ کەچۆتە تەمەنێکی گەورە (تواناى هیچی نەماوە) وەپیاوێـک لەفەترەدا مردووە (بانگەوازی پێغەمبەرانی پێنەگەیشتوە)... ئەم چوارە لەقیامەت اللّه پەیمانیان لێ وەرئەگرێت کەاللّه هەرچیان پێ بڵێت بەقسەی اللّه بکەن بۆیە اللّه کەسێکیان بۆئەنێرێت فەرمان بەو چوار جۆرە خەڵکە ئەکات وپێیان ئەڵێت بچنە دۆزەخەوە جائەوەی بەقسەی ئەو نێردراوەی اللّه بکات لەقیامەتدا وبڕوات بەرەو دۆزەخ ئەوا بۆی ئەبێت بەساردی وسەلامەتی (دۆزەخ نایسوتێنێ بەڵکو ئەخرێتە بەهەشتەوە چونکە ڕووکەشەکەی دۆزەخە تا اللّه دەری بخات کەکێ**

گوێڕایەڵ ئەبێت وکێش سەرپێچی ئەکات ) ئەوەشی گوێڕایەڵی نەکات نەچێتە دۆزەخەوە ئەوا بەزۆر ڕاپێچی ئاگری دۆزەخ ئەکرێت.

أخرجه أبو نعيم في ((تاريخ أصبهان)) (225/2)، والبيهقي في ((الاعتقاد)) (ص169)

بەڵام لەدوونیادا پێیان ئەوترێ کافر وموشـریک وەک ئیمام ـی ابن قیم لە طریق الهجرتین ئەفەرمووێت ( **وأما في أحكام الدنيا فهي جارية مع ظاهر الأمر، فأطفال الكفار ومجانينهم كفار في أحكام الدنيا، لهم حكم أوليائهم، وبهذا التفصيل يزول الإشكال في المسألة** ).

بەڵام حوکمـــــــی دوونیـا لەسەر ڕووکەش ئەدرێت منداڵی کافران و شێتەکانیان لەدوونیادا حوکمـی کافریان هەیە وەک سەرگەورەکانیان بەم شێوەیە کێشەکان لائەچێت لەم بابەتەدا.

جـــــۆری دووەم / بریتیە لەو کەسە موشـریکەی لەدوونیادا ئاگای لێ بوە خەڵکانێک هەن تەنها اللّه ئەپەرستن وپێچەوانەی شیرکــن بەڵام ئەم کەسە نەگەڕاوە و هەوڵی نەداوە خۆی فێری ئەوتەوحیدە بکات جائەگەر کەســێ بەم حاڵەوە بمرێت شاهێدی دۆزەخ ـی بۆ دەدرێت .

أعرابیّەکـ هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی ( **يا رسولَ اللّهِ إنَّ أبي كانَ يصِلُ الرَّحمَ وَكانَ وَكانَ فأينَ هوَ قالَ في النَّارِ**)

ئەی ڕسول اللّه ﷺ باوکم کاتی خۆی سیلەی ڕەحم ـی دەگەیاند و ئاوا و ئاوا چاکەی دەکرد ئایا باوکم لەکوێیە ؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی لە دۆزەخە

پیاوەکە وتی ئەی رسولَ اللّهِ ﷺ ( **فأينَ أبوكَ قالَ رسولُ اللّهِ ﷺ حيثُما مررتَ بقبرِ مشرِكٍ فبشِّرْهُ بالنَّارِ قالَ فأسلمَ الأعرابيُّ بعدُ وقالَ لقد كلَّفني رسولُ اللّهِ ﷺ تعبًا ما مررتُ بقبرِ كافرٍ إلَّا بشَّرتُهُ بالنَّارِ** )

ئەی باوکی خۆت لەکوێیە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی هەرکاتێ گەشـتی بەگۆڕێ هەر هاوبەشدانەرێ موژدەی دۆزەخ ـی پێ بـە کابرای دەشتەکی بوو بە موسڵمان وپاشان وتی پێغەمبەر ﷺ ئەرکێکی پێ ڕاسپاردووم بەلای گۆڕی هیچ کافرێ تێنەپەڕیوم ئیلا موژدەی دۆزەخ ـم پێداوە . ( صحيح ابن ماجه 1288 )

چونکە پێش هاتنی ئیسلام دینە هەقەکەی ابراهیم علیه السلام مابوو بەڵام خەڵکـ خۆیان دەست بەرداری شیرک نەبووبوون .

ئیمام ـی ابن قیم رحمە اللّە ئەفەرموویێت لەطريق الهجرتين 412

**الأصل الثاني: أنَّ العذاب يستحق بسببين، أحدهما: الإعراض عن الحجة، وعدم إرادة العلم بها وبموجبها، الثاني: العناد لها بعد قيامها، وترك إرادة موجبها، فالأول كفر إعراض، والثاني كفر عناد، وأما كفر الجهل مع عدم قيام الحجة، وعدم التمكن من معرفتها؛ فهذا الذي نفى اللّه التعذيب عنه حتى تقوم حجة الرسل.**

بنەمای دووەم : سزای قیامەت بەدوو هۆکار بەدی دێت

هۆکاری یەکەم ئەوکەسـە پشت هەڵبکات لەبەڵگـە وە ئیرادەی نەبێت خۆی فێری دین بکات و کار بەداخوازیەکانی بکات .

هۆکاری دووەم عینادی کـردن بەرامبەر بەبەڵگە وعینادیکردن بەداخوازیەکانی .

جا جۆری یەکەم کوفری پشتهەڵکردنە جۆری دووەم کوفری عینادە ، بەڵام کوفری نەزانین کەاللّە تعالی نەفی کردوە خاوەنەکەی سزابدات بریتیە لەوکەسەی کە تووانای

خۆفێرکردنی نیە ئەم جۆرەیە اللّه نەفی کردوە سزای بات تا ئیقامە حوجەی دەکات بەناردنی پەیامبەر (چی لەدوونیا پەیامبەری بۆبنێرێت یان لەقیامەت).

کە واتـا هەرکەسـێ حوجەی پێ گەیشتبوو لەسەر شیرکـ مرد ئەوا شاهێدی دۆزەخ ـی بۆ دەدرێت وە هەرکەسێ لە قورئان بە دیاریکراوی ناوی هاتبێت کە دۆزەخیە شاهێدی دۆزەخ ـی بۆ دەدرێت ، وەکـ فیرعەون وابلیس و ابی لەهەب و خێزانەکەی و ابی طالب و عمرو بن لحی ... هتد

وە لە شـەرعدا ڕێگری کراوە لەشاهێدی ـدان بەوەی بەدیاریکراوی بوترێ فلّان شەهیدە چونکە کەوتت شەهیدە واتا اللّه جیهادەکەی لێ قبوڵ کرد و خستیە بەهەشتەوە وە شوێنی شەهید تەنها بەهەشتە .

هەر بۆیە ئیمام ـی البخاري لە صحیحەکەیدا لە (كتاب الجهاد والسير).ـدا دەگێڕێتەوە

أبو هريرة لەپێغەمبەر ﷺ ـەوە کەفەرموویەتی : "**اللّه أعلم بمن يجاهد في سبيله، واللّه أعلم بمن يُكلَم في سبيله**".

تەنها اللّه خۆی ئاگادارە بەوەی کە کێ لە پێناو الله دەجەنگێت وە هەر اللّه خۆی ئاگادارە کەکێ لەپێناو اللّه بریندار ئەبێت.

ابن حجر لە فتح الباري [جـ 6/ 90] گێڕاویەتیەوە : ( **باب لا يقال فلان شهيد** ) ناوترێت فـــــلّان کەس شەهیدە ( **أي على سبيل القطع بذلك إلا إن كان بالوحي**، )

واتـا نابێت بەشێوەی یەکلاکەرەوە شایەتی بدرێت وبوترێ فلّان کەس شەهیدە تەنها بەوەحی نەبێت .

ئیمام ـی عمر وتارێکی ـدا وفەرمووی " **تقولون في مغازيكم فلان شهيد، ومات فلان شهيدًا.. ألا لا تقولوا ذلكم، ولكن قولوا كما قال رسول اللّه ﷺ : "من مات في سبيل اللّه، أو قُتل فهو شهيد** "

ئێوە لەجەنگەکانتان ـدا ئەڵێن فڵان شەهیدبوو وە فڵان بەشەهیدی مرد نەخێر وامەڵێن بەڵکـو ئەوە بڵێن کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی هەرکەسێ لەپێناو اللّه بمرێ یان بکوژرێ ئەوە شەهیدە (واتـە بەشێوەی عـام وابڵێن کەس تەحدید مەکەن ومەڵێن فڵان کەس شەهید بوو ).

وە شایەتی بەهەشـت بەدیاریکراوی بۆ کەس نادرێت تەنها ئەوانە نەبێت کە لە قورئان وسونەت بە دیاریکراوی شاهێدی بەهەشتیان بۆدراوە .

سعيد بن زيد رضي اللّه عنه فەرمووی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (**عشرة في الجنة: أبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعلي وعثمان والزبير وطلحة وعبد الرحمن وأبو عبيدة وسعد بن أبي وقاص، قال: فعد هؤلاء التسعة، وسكت عن العاشر،**

دەکەس لە بەهەشتە ابوبکر لەبەهەشتە وعمر لەبەهەشتە وعلی وعثمان و زوبەیر وطلحە و عبدالرحمن وابو عوبیدە وسعدی کوڕی ابی وقاص لەبەهەشتن پاشان ئەوەی فەرموودەکە ئەگێڕێتەوە ولەکەسی دەیەم بێدەنگ بوو

**فقال القوم: ننشدك اللّه يا أبا الأعور من العاشر؟ قال: نشدتموني باللّه، أبو الأعور في الجنة**)

خەڵکەکە وتیان سوێندت ئەیەین ئەی ابوالاعور واتە (نازناوی سعید بن زید ئەوەی فەرموودەکە ئەگێڕێتەوە ) کەسی دەیەم کێیە ؟ فەرمووی سوێندتان ـدام کەسی دەیەم خۆمم ابوالاعوریش لەبەهەشتە . رواه الترمذي وأبو داود والنسائي .

وە جگە لەم دەهاوەڵە شاهێدی بەهەشت بۆهاوەڵی تریش ـدراوە

نمونەی عبد اللّه ـی کوڕی مسعود، وثابت بن قیس، وعبد اللّه بن سلام . وبيلال ـی حەبەشی وە ئەهلی بەیعەت ـی رضوان و ئەهلی بەدر

رسول اللّه ﷺ فەرمووی :

" **لا يدخل النار أحد ممن بايع تحت الشجرة** " . رواه مسلم

هیچ یەکێ کەبەیعەت ـی یا لەژێر دارەکە ناچێتە دۆزەخەوە.

وە فەرمووی ﷺ : **لن يدخل النار رجل شهد بدرا والحديبية** .

رواه أحمد وأصحاب السنن

هیچ یەکێ کەبەشداری بەدر و حودەیبیە ـی کردووە ناچێتە دۆزەخەوە.

ئەوانەی بەشداری بەدریان کرد ژمارەیان سەرو سـێ سەد کەس بوو

وە ئەوانەشی بەشداری حودەیبەیان کرد هەندێ ئەڵێن هەزارو چوارسەد کەس بوون وهەندێ دەڵێن هەزار وپێنج سەد کەس بوون.

کەواتـە مەبەستمان ئەوەیە جگە لەو دەکەسە شایەتی بەتەحدیدکراوی بۆ صحابەی کەش ـداراوە.

**سوفیان ـی ثەوری بە شوعەیب ـی فەرمووە**

**يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ لَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتُ لَكَ حَتَّى تَرَى الْمَسْحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ**

**ئەی شوعەیب ئەوەی بۆم نوسیوی سودت پێ ناگەیەنێت تاوەکـ مەسح لەسەر خوف ( گۆرەوی ئەستور ) بەشەرع ـی ئەزانیت .**

**مەسحکردن لەسەر گۆرەوی بریتییە لەوەی لەبری شۆردنی پێیەکان دەستت تەڕدەکەی دەیهێنیت بەسەر گۆرەویەکەتـدا ، ئەمەش کاتێ ئەنجام دەدرێت کەئەو گۆرەویەت بەدەست نوێژەوە لەپێ کردبێت**

**ئایا مەسح لەسەر گۆرەوی ماوەی کاتەکەی چەندە ؟**

**ماوەی مەسح کـردن لەسەر گۆرەوی بۆ کەسێ لەسەفەردایە سێ شەو و ڕۆژە بەڵام بۆکەسێ کە لە شاری خۆیەتی یەکـ شەو ڕۆژە واتە 24 سەعات .**

**ئیمام ـی مسلم دەیگێڕێتەوە بە ژمارە (276) شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ دەفەرموویێتم هـاتم بۆلای دایکە عائیشە و پرسیارم لێـکرد لەسەر مەسح لەسەر خوف**

**پێی وتـم : " عَلَيْكَ بِابْنِ أَبِي طَالِبٍ فَسَلْهُ فَإِنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِّ ﷺ ، فَسَأَلْنَاهُ فَقَالَ : ( جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِّ ﷺ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ ، وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ ) ".**

**بڕۆ پرسیار لە علی کـوڕی ابی طالب بکە ئەو لەگەڵ پێغەمـبەر ﷺ سەفەری کـردوە**

**بۆیە پرسیارمان لێکرد ئەیفەرموو ( پێغەمـبەر ﷺ سێ شەو و ڕۆژی داناوە بۆ کەسێ لەسەفەردایە وە ڕۆژ وشەوێ بۆئەوکەسەی لەشاری خۆیدایە)**

ئیمام ـی الترمذي و وأبو داود و وابن ماجه دەیــگێڕنەوە کە پێغەمــبەر ﷺ فەرموویەتی

( **لِلْمُسَافِرِ ثَلاثَةٌ ، وَلِلْمُقِيمِ يَوْمٌ** ) بۆ کەسی مسافر سێ ڕۆژ و بۆ دانیشتوو ڕۆژێک.

وروى الترمذي والنسائي ووابن ماجه (478) ئەیگێڕنەوە لە صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ رضي اللّه عنه فەرموویــەتی ( **كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنَا إِذَا كُنَّا سَفرًا أَنْ لا نَنْزِعَ خِفَافَنَا ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيهِنَّ إلا مِنْ جَنَابَةٍ** )

پێغەمــبەر ﷺ فەرمانی پێ ئـەکردین گەر لەسەفەرا بوینایە کە خوفەکانمان دانەکەنین تا سێ شەو ڕۆژ ئیلا مەگەر بۆکاتی لەشـگرانی .

بۆنموونە تۆ دەست نوێژ هەڵئەگری بۆ نوێژی بەیانی وگۆرەویەکانت لەپێ ئــەکەی ئیتر بۆت جائیزە تا نوێژی بەیانی داهاتوو تەنها مەسح لەسەر گۆرەویەکانت بکەی پێویست بە شۆشتنی پێیەکانت نــاکات ، وە ئەگەر لەسەفەردا بوی تا سێ شەو ڕۆژ بۆت هەیە ئەم کارە بــکەیت.

ئایا بەتەواو بوونی کــاتی مەسح دەست نوێژ ئەشــکێت ؟ واتا 24 سعات ـی ڕێـک تۆ مەسحت لەسەر گۆرەوی کردووە بەڵام پێش ئەوەی ببێت بە24سعات دەست نوێژت تازەکردەوە ئایا دوای 24 وبەسەرچونی ماوەی مەسح لەسەر خوف دەست نوێژەکەت شکاوە ؟

وەڵام نەخێر هیچ بەڵگـەیەک نەهاتووە بڵێت کە دەست نوێژ بەتەواو بوونی کات ـی مەسح ئەشــکێت چونکە هەڵوەشـێنەرەوەکانی دەست نوێژ زانراوە لای هەموو کەسێ ئەمەش هەڵبژاردەی ابن تيميه وابن حزم و زۆرێ لە زانایانە .

"المحلى 151/2 الاختيارات الفقهية ص 15 ، الشرح الممتع 216/1" .

بۆیــە تۆ ئـەگەر تا پێش نوێژی نیوەڕۆ بە گۆرەویەکانتەوە دەست نوێژت هەبێت کەکاتی نوێژی نیوەڕۆ هات ئیتر کاتی مەسح لەسەر گۆرەویت تەواو ئەبێت ئەوا تۆ دەست نوێژت هەر ماوە ، ئەتوانی نوێژ بکەی بەڵام بۆ مەسح کردن لەسەر گۆرەویەکانت بۆ دەست نوێژی نویٚ ئەوا نابێت مەسح بکەیت ئەبێت ئیلا لەگەڵ دەست نوێژ پێیەکانت بشۆی ئینجا گۆرەویەکانت لەپیٚ بکەی و دەست بەمەسح بکەیتەوە بۆ نوێژەکانی تر ، بـــۆیە گرنگە ئاگاداری کاتی گۆرەویەکانتان بن لەوکاتەی خۆی تێپەڕیٚ مەسح لەسەری باتڵە و نوێژتان قبوڵ نابێت .

**ئایا ئەگەر بەمەسح لەسەر گۆرەوی دەست نوێژم هەڵگرت ودواتر گۆرەویەکانم داکەند دەست نوێژم ئەشـکیٚ ؟**

وەڵام / کەسیٚ لە نوێژی نیوەڕۆدا بە دەستنوێژەوە گۆرەوی لەپیٚ کرد بەڵام بۆ نوێژی عەسر گۆرەویەکانی دائەکەنێت بەڵام دەست نوێژەکەی نەشکاوە ئایا بەداکەندنی گۆرەوی دەست نوێژەکەی ئەشـکێت و ئەبێت دەست نوێژی تازە هەڵگرێتەوە بۆ نوێژی عەســر ؟

زانایـان لەم بارەیەوە ڕاجیاوزان

① حەنەفیەکان و وتەی کۆتای ئیمام شافعی وڕیوایەتێکە لە ئیمام احمد

ئەڵێن / هەرکــات گۆرەویەکانی داکەند پێویستە تەنها پێیەکانی بشوات .

② مالکیەکان ئەڵێن ئەبێت ڕاستەوخۆ دوای داکەنـدنی گۆرەوی پێیەکانی بشۆریٚ ئەگەر ڕاستەوخۆ نەیششت وکاتێکی بەسەردا تێپەڕیٚ ئەبێت دەست نوێژ تازە بکاتەوە چونکە موالاتی دەست نوێژی تێدا نەماوە .

③ وتەی کۆنی شافعی و بەشیٚ لەحەنابلە ئەڵێن بەداکەندنی گۆرەوی دەست نوێژ ئەشـکێت .

④ وتەی دروست وپەسەند ئەوەیە کەدەست نوێژی ناشکێت بەداکەندنی و دەستنوێژەکەی دروستە وپێویست بەپێ ششتن ناکات ئەمەش وتەی ابن حزم وابن تیمیە یە چونکە کابرا دڵنیاییە کەدەست نوێژی هەیە وە هیچ بەڵگەیەک نەهاتوە بڵێت کەسێ دەست نوێژی هەبێت بەداکەندنی گۆرەوی یان خوف دەستنوێژی ئەشکێت ، بەڵگەش ئەوەیە

ابن أبي شيبه لەأبي ظبيان دەیگێڕێتەوە ـدەفەرموویێـت ( **رأيت علياً بال قائماً ،ثم توضأ ، ومسح على نعليه ، ثم أقام المؤذن فخلعهما _ زاد البيهقي _ ثم تقدم فأمَّ الناس** )

بینیم ئیمام ـی علی قەزای حاجەی کرد و پاشان دەست نوێژی کرد ومەسح ـی لەسەر نەعلەکانی کرد پابان بانگبێژ ئیقامەی نوێژی کرد ئیمام علی نەعلەکانی داکەند ( لە ڕیوایەتی بەیهەقی ئەوەش هاتووە ) پاشان ئیمام علی دەستی بە نوێژکرد وپێش نوێژی بۆ خەڵکـ کرد .

ئەمە وتەی پەسەندە الله اعلم چونکە گەر کەسێ دەست نوێژ هەڵبگرێت بێگومان لەناو دەست نوێژ مەسح ـی قژی ئەکات ، دوای دەست نوێژگرتن بڕوات قژی کورت بکاتەوە یان سفری بـکات ئایا پێویست ئەکات دەست نوێژێ تر هەڵبگرێت و مەسح ـی سەری دووبارە بکاتەوە ؟ یان هەر دەست نوێژەکەی ئەمێنتەوە؟

بێگومان دەست نوێژی ئەمێنتەوە بۆیە ئەو کەسەشی کەبەگۆرەویەوە دەست نوێژی هەیە بە داکەندنی هەر دەست نوێژی هەیە و هیچ بەڵگە نەهاتوە لەسەر هەڵوەشانەوەی دەست نوێژ بەداکەنـدنی گۆرەوی .

**ئیمام ـی سوفیان ـی ثەوری فەرمووی**

**يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ وَلَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتَ حَتَّى يَكُونَ إِخْفَاءُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ فِي الصَّلَاةِ أَفْضَلَ عِنْدَكَ مِنْ أَنْ تَجْهَرَ بِهِمَا**

**ئەی شوعەیب سودت پێ ناگەیەنێت ئەوەی نوسیوتە تاوەک شاردنەوەی بسم اللّه الرحمن الرحيم بەباشتر نەزانیت لەوەی بەئاشكرا بیخوێنیت .**

**خوێندنی بسم اللّه الرحمن الرحيم بەدەنگی بەرز لەو نوێژانەی كە بەدەنگ قورئانیان تێدا ئەخوێنرێت ، بێگومان باشتر وسونەت ئەوەیە وەک ئیمام ـی سفیان فەرمووی كە بەدەنگ نەخوێنرێتەوە چونكـە پێغەمبەر ﷺ بەنهێنی بسم اللّه الرحمن الرحيم ـی ئەخوێندەوە لە نوێژەكاندا**

**ئەنەس رضي اللّه عنه دەگێڕێتەوە ئەفەرموێت پێغەمبەر ﷺ وئەبوبكر وعـمر ( كَانُوا يَفْتَتِحُونَ الصَّلَاةَ بِـ ( الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ) . رواه البخاري ( 743 ) .**

**نوێژیان بە خوێندنی الحمـدللّه رب العالمين دەست پێدەكرد (واتە بسم اللّه یان بەنزمی دەخوێند نەک بەدەنگەوە)**

**لەڕیوایەتێكی تـردا ئەفەرمووێت :**

**"صلى بنا رسول اللّه ﷺ ، فلم يُسمِعْنا قراءة ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾، وصلى بنا أبو بكر وعمر، فلم نَسمَعْها منهما " أخرجه النسائي (870)**

**پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی بۆكردین گوێمان لێ نەبوو بسم اللّه الرحمن الرحيم بخوێنێت وەئەبوبكر وعمر پێش نوێژیان بۆكردین بەهەمان شێوە.**

**ئیمام ـی الدارمي لە "سننه"كەیدا 1/ 283 بە ناونیشان ـی" باب كراهية الجهر**

بـ ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ بابەت ـی کەڕاهەت ـی ئاشکرا خوێندنی بسم اللّه الرحمن الرحيم لە نوێـژدا ، فەرموودەکەی ئەنـەس ـی هێناوەتەوە کە ئەفەرموویت " أن النبي ﷺ وأبا بكر وعمر وعثمان كانوا يفتتحون القراءة بالحمد للّه رب العالمين "،

پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبکر وعمر وعثمان وعلى نوێژیان بەخوێندنی الحمـدللّه رب العالمين دەست پێئەکرد .

ئیمام ـی الدارمی ئەفەرموێت : **وبهذا نقول، ولا أرى الجهر بـ** ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾.

ئێمەش هەمان شت ئەڵێین لەگەڵ وتنی بسم اللّه الرحمن الرحيم بەدەنگەوە نین.

ئیمام ـی ابن خزیمة لە "صحيحه کەیدا 1/ 249 ، باب ذكر الدليل على أن أنسًا إنما أراد بقوله : " **لم أسمع أحدًا منهم يقرأ** : ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾؛ **أي : لم أسمع أحدًا منهم يقرأ جهرًا** ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾، **وأنهم كانوا يُسِرُّونَ بـ** ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ **في الصلاة** ".

واتـە باسی ئەوبەڵگەیەی کەئەنەس فەرمووی کەسمان گوێمان لێ نەبوو پێغەمبەر ﷺ بسم اللّه الرحمن الرحيم بەدەنگەوە بخوێنێت واتـا کەسیان گوێیان لێ نەبوە بە ئاشکرا بسم اللّه بخوێنت بەڵکو لەنوێژدا بەنهێنی بسم اللّه الرحمن الرحيم ـیان ئەخوێندەوە.

ئیمام ـی الدارقطني ئەفەرموویت : " **كل ما رُويَ عن النبي ﷺ في الجهر ، فليس بصحيح، وأما عن الصحابة فمنه صحيح ومنه ضعيف** ".التحقيق" لابن الجوزي (1/ 313).

هەموو ئەو ڕیوایەتانەی لەپێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە کەگوایە بسم اللّه ـی بەدەنگ بەرزخوێندووە هیچیان سەحیح نین بەڵام ئەوەی لە صحابەوە هاتووە گوایە صحابە هەبوە بەدەنگ خوێندوویەتی ئەوانە هەندێکی سەحیحە وهەندێکی زەعیف ـە.

شيخ الإسلام ابن تيمية – رحمه اللّه – ئەفەرمووێت : ( **ومع هذا : فالصواب أن ما لا يُجهر به ، قد يشرع الجهر به لمصلحة راجحة ، فيشرع للإمام – أحيانا – لمثل تعليم المأمومين ،**

لەگەڵ ئەوەشـدا دروست ئەوەیە بسم اللّه بەئاشکرا نەخوێنرێت بەڵام ئەگەر مەسڵەحەتێکی ڕەچاوکراو هەبێت دروستە بۆ پێش نوێژ خوێن هەندێجار بەدەنگ بیخوێنێت بۆنموونە بۆ فێرکردن ـی ئەوانەی لە دوایەوە نوێژ ئەکەن ،

**ويسوغ للمصلين أن يجهروا بالكلمات اليسيرة أحيانا ، ويسوغ أيضا أن يترك الإنسان الأفضل لتأليف القلوب واجتماع الكلمة ،**

وە دروستە بۆ نوێژخوێنان هەندێ جار هەندێ وشە بەدەنگی بەرز بڵێن وە دروستە مرۆڤ باشترینەکە واز لێ بێنێت بەمەبەستی یەکڕیزی موسڵمانان و یەکگرتنی دڵەکان ،

**كما ترك النبي ﷺ بناء البيت على قواعد إبراهيم ؛ لكون قريش كانوا حديثي عهد بالجاهلية ، وخشي تنفيرهم بذلك ، ورأى أن مصلحة الاجتماع والائتلاف مقدمة على مصلحة البناء على قواعد إبراهيم ،**

هەروەک چۆن پێغەمبەر ﷺ وازی هێنالەوەی بینای کەعبە لەسەر شێوەکەی پێغەمبەر ابراهیم بنیاد بنێتەوە لەبەرئەوەی قوڕەیش تازە ببون بەموسـڵمان وترسی ئەوە هەبوو کە دووربکەونەوە لە ئیسلام وای بینی مەسڵەحەت لە یەکڕیزی و کۆبوونەوە لەسەر ئیسلام لە پێشترە لە بیناکردنەوەی کەعبە لەسەر شێوەکەی ابراهیم .

مجموع الفتاوى " ( 22 / 436 ، 437 ) .

ئیمام ـی ابن كثير لە تفسیرەکەیدا (1/ 36) ـدەفەرموویت :

" أجمَعوا على صحة صلاة مَن جهر بالبسملة، ومن أسَرَّ بها، وللّه الحمد والمنة ".

زانایان هەموویان یەکدەنگن لەسەر دروست ـی نوێژی ئەوکەسەی بەدەنگەوە بسم اللّه بخوێنێت یان بە نهێنیەوە وللّه الحمد والمنه.

---

ئیمام ـی سوفیان بەشوعەیب ئەفەرموویت :

شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ لَا يَنْفَعُكَ الَّذِي كَتَبْتَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ وَحُلْوِهِ وَمُرِّهِ ، كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ

ئەی شوعەیب سودت پێ ناگەیەنێت ئەوەی نوسیوتە تاوەکـ بڕوا بە قەدەر ئەهێنیت بەخێر وبەشەڕیەوە بەشیرن وتاڵیەوە هەمووی لەلایەن اللّه عز وجل ـوەیە .

پاشـان ـدەفەرموویت

يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ وَاللَّهِ مَا قَالَتِ الْقَدَرِيَّةُ مَا قَالَ اللَّهُ ، وَلَا مَا قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ ، وَلَا مَا قَالَ النَّبِيُّونَ ، وَلَا مَا قَالَ أَهْلُ الْجَنَّةِ ، وَلَا مَا قَالَ أَهْلُ النَّارِ ، وَلَا مَا قَالَ أَخُوهُمْ إِبْلِيسُ لَعَنَهُ اللَّهُ ،

قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ : ﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾

[الجَاثِيَة : ٢٣]

ئەی شوعەیب واللە ـی ئەوەی قەدەریەکان وتیان اللە نەیفەرمووە وە فریشتە نەیگوتوە وە پێغەمبەران نەیانگوتوە وە ئەهلی بەهەشت وئەهلی دۆزەخ نەیان گوتوەهەتا ابلیسی لەعنەت ـی برایان وای نەوتووە اللە تعالی ئەفەرموویت

ئایا تۆ ئەو کەسەت دیتووە کە هەواو ئارەزووی خۆی دەکردۆتە پەروەردگاری خــۆی ودەیپەرستێت ؟! وە اللە لەسەر زانینێک کە بەرامبەر ئەو کەسە بوویەتی ، پێش ئەوە دروستی بکات- گومڕایکردووە وە مۆریشی بەسەر گوێ و دڵیدا ناوە، هیچ خێرو بێرێکیان تێناچێت و پەردەیەکیشی بەســــەر چاویدا هێنـــاوە جا کێ هەیە پاش اللە رێنمایی رێـــی راستیی بکات ، ئەگەر ئەو خۆی نـــەیکا ؟ دە ئایا ئامۆژگاری ناگرن .

وَقَالَ تَعَالَى: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ [التَّكْوِير : ٢٩]

وەاللە تعالی فەرمووی ( ئێوە وویستان نابیت تەنها مەگەر اللە ویستی لەسەر بێت )

وەفریشتەکان وتیان : ﴿ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾

[البَقَرَة : ٣٢]

پاکــو بێ گەردی بۆ تۆ پەروەردگار ئێمە هیچ زانستێکمان نییە تەنها ئەوە نەبێت کە خۆت فێرتکــردووین تۆ زانا وکار جوانــی

وە مُوسَا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی : ﴿ إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ ﴾ [الأَعْرَاف : ١٥٥] واتا : پەروەردگارم بەڕاستی ئەمە تاقیکردنەوەی خۆتە بەویستی

خۆتە کەبتەوێ هەرکەسێ گومڕابکەیت و هەربەویستی خۆتە بتەوێ هیدایەت ــی هەرکەســێ بەیت .

وە نُوحٌ عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی ﴿ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ [هُود : ٣٤]

خۆ ئەگەر اللە بییەوێ گومڕاشتان بکاو رێتان لێتێک بدا، ئیتر من هەرچەند ئامۆژگارییتان بکەم بۆ سوودو کەڵکی ئێوە، سوودو کەڵکی نابێ بۆتان، چونکە اللە خۆی دەیەوێ گومڕابن، دیارە کەئیتر هەرگیز ناتوانن لە ئیرادەی ئەو دەرچن هەر ئەویشە پەروەردگارتان و هەر بۆلای خۆیشی دەچنەوەو، حیساب و لێکۆڵینەوەتان لەگەڵدەکات .

وە پێغەمبەر شُعَيْبٌ عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی:

﴿ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾[الأَعْرَاف : ٨٩]

هەرگیز بۆمان رەوا نییەو شیاو نییە بگەڕێینەوە بۆ نێوی  مەگەر اللە ــی پەروەردگارمان ویستی لەسەربێت ولەمیهرەبانی خۆی بێبەشمانکات، دیارە ئەوکات دەسەڵاتمان نییە زانستی پەروەردگارمان هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئاگای لەئێستاو لە رابوردوویە .

وە بەهەشتیەکان وتیان

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾ [الأَعْرَاف : ٤٣]

سوپاس بۆ ئەو اللە یەی هیدایەت ــی داین خۆ ئەگەر خۆی ڕێنمایی نەکردباین، هەرگیز هیدایەت ـدراو نەئەبووین

وە دۆزەخیەکان ئەڵێن: ﴿ غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ ﴾ [المُؤْمِنُون : ١٠٦]

به کەساسیێکەوە دەڵێن: پەروەردگارمان! نەگبەتیی و بەدبەختی بەسەرماندا زاڵ بوو و گەلێکی گومڕاو سەرلێشێواو بووین.

ابلیس ـی برایان بەلەعنەت بێت وتی ﴿ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي ﴾ [الحِجر : ٣٩]

ئەوجا شەیتان کەوتە ململانێ و عینادەوەو وتی: چونکە گومڕاتکردم منیش ڕێ ڕاستەکەی تۆیان لێبگرم.




بڕوا هێنان بەقەدەر یەکێکە لەپایەکان ـی ئیمان وخەڵکانێکی زۆر لەم بابەتەدا گومڕا وسەرلێشواوبوون وهەقیان نەپێکاوە

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموویت : ( **لا يؤمن عبد حتى يؤمن بأربع : يشهد أن لا إله إلا اللّه ، وأني محمد رسول اللّه بعثي بالحق ، ويؤمن بالموت ، ويؤمن بالبعث بعد الموت ، ويؤمن بالقدر** )

بەندە ئیمان ناهێنێت تابڕوای بەچوار شت نەبێت شایەتی ـدان بە لا اله الا اللّه و محمد رسول ـی اللّه یە وبەهەق ڕەوانەکراوە وەبڕوای بەمردن و زیندووبونەوەی پاش مردن هەبێت وبڕوای بەقەدەر هەبێت . ( رواه ابن حبان في صحيحه )

① قەدەر نوسراوە پێش دروستکردن ـی مخلوقات بە 50 هەزار ساڵ

عبد اللّه ـی كوڕی عمرو بن العاص رضي اللّه عنه دەفەرمویّت بیستم لە رسول اللّه ﷺ دەیفەرموو ( **كتب اللّه مقادير الخلائق قبل أن يخلق السموات والأرض بخمسين ألف سنة وعرشه على الماء** )

اللّه تعالى قەدەری هەموو دروستكراوەكانـی نوسی پێش ئەوەی ئاسمانەكان وزەوی دروست بكات بە پەنجا هەزار ساڵ وەعەڕشەكەی لەسەر ئاوە .

( رواه مسلم في الصحيح )

لە قەدەردا ئیمان وكوفر و خۆشی وناخۆشی ورزق وژیان وبەهەشتی بوون و دۆزەخ ـی بوونی هەموو بەندەكان نوسراوە

لە صحيح ـی مسلم لە علي بن أبي طالب رضي اللّه عنه هاتوە فەرموویەتی

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( **ما منكم من أحد ما من نفس منفوسة إلا وقد كتب اللّه مكانها من الجنة والنار وإلا قد كتبت شقية أو سعيدة** )

هەریەكـێ لە ئێوە وەهەموو نەفسێك ئیلا اللّه تعالى جێگاكەی بۆی نوسیوە لە بەهەشت ولە دۆزەخ وە اللّه بۆی نوسیوە خۆش بەخت ئەبێت یان بەدبەخت

قال: فقال رجل: **يا رسول اللّه أفلا نمكث على كتابنا وندع العمل**

پیاوێـك وتی ئەی پێغەمبەری اللّه ﷺ مادام هەموو شتێكمان نوسراوە و بڕاوەتەوە بۆچی وازلەكاركردن نەهێنین وەچاوەڕوانی ئەو قەدەرە بین كەبۆمان نوسراوە

**فقال من كان من أهل السعادة فسيصير إلى عمل أهل السعادة ومن كان من أهل الشقاوة فسيصير إلى عمل أهل الشقاوة ثم قرأ :** ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ

بِٱلْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ۝٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴾ [ اللَّيل : ٥ - ١٠ ]

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی هەرکەسێ لەئەهلی خۆشەبەختی نوسرابێت لەقەدەردا ئەوا لەدوونیادا بەکرداری ئەهلی خۆشبەختەکان کردار ئەکات وەهەرکەسێکیش لە قەدەردا لە بەدبەختەکان تۆمارکرابێت ئەوا بەئاڕاستەی کرداری بەدبەختەکان لەدوونیا کردارئەکات پاشان ئەم ئایەتەی خوێندووە ( ئەوکەسەی ماڵ ئەبەخشێت وتەقوای اللّه ـی کرد وبڕوای بەپاداشتی اللّه هێنا ئەوا ڕێنمای وئاڕاستەی ئەکەین بوڕاستە ڕێگا وە ئەوەشی ڕەزیل ـی بکات لەبەخشین و بڕوای نەهێنا ئەوا ئاڕاستەی دەکەین بۆ دژوارترین ڕێگە ).

تەنانەت هەر گوناهێکـ ئەنجام بدرێت ئەوا بەقەدەری اللّه نوسراوە جا لە حیکمەتـی اللّه یان ئەوەیە ئەوگوناهەی نوسیوە تائەو بەندە لەغرور بوون بپارێزێ و تەوبەشی بەقسمەت ئەکات یان ئەیەوێ بەوگوناهە ئەو بەندەیەی سەرلێشواوبکات و بیخاتە دۆزەخەوە چونکە بەندەکان هەموویان موڵکی اللّه ـن ئەگەر اللّه لەخۆڕا هەمووشیان بخاتە دۆزەخەوە ستەم ـی لێ نەکردوون چونکە موڵکی اللّه ـن .

رسولَ اللّهِ ﷺ فەرموویەتی :

**( إنَّ اللّهَ لو عذَّبَ أهلَ سماواته، وأهلَ أرضِه: لعذَّبَهم وهو غيرُ ظالمٍ لهم، ولو رحِمَهم كانتْ رحمتُهُ خيرًا لهم مِن أعمالِهم، ولو أنَّ لك مِثْلَ أُحُدٍ ذهبًا، أنفقتَه في سبيلِ اللّهِ: ما قَبِلَه اللّهُ منكَ حتى تؤمِنَ بالقدَرِ )**

ئەگەر اللّه تعالی سزای هەموو خەڵکی ئاسمانەکان وزەوی بـات ئەوا ستەمی لێ نەکردوون خۆ ئەگەر ڕەحمیشیان پێ بـکات ئەوا ڕەحم ـی اللّه باشترە بۆیان

لەکردارەکانیان ئەگەر بەئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون ببەخشیت اللّه لێت وەرناگرێت تا بـڕوا بەقەدەر ئەهێنت .            "أخرجه أبو داود(4699)صحيح سنن أبي داود".

وە اللّه تعالى خۆی کاتێ مرۆڤەکان ـی دروست کرد بەشـێکی دروست کردووە بۆ بەهەشت و کرداری باشـی بۆنوسیون وەبەشێکی تری بەدبەختی کردووە و بۆ پڕکردنی دۆزەخ دروست ـی کردوون چونکە اللّه بەشایستەی بەهەشت وهیدایەت ـی نەزانیون .

أبو داود لە سننەکەیدا بەسەنەدی صحيح لە مسلم بن يسار الجهني کە پرسیار کـرا لە عمر بن الخطاب لەبارەی ئەم ئایەتەوە ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ ﴾ [الأَعۡرَاف : ١٧٢]

ئیمام ـی عمر فەرمووی: ( **سمعت رسول اللّه ﷺ ، سئل عنها،**

بیستم ئەو پرسیارە لە رسول الله ﷺ کـرا

فقال: رسول اللّه ﷺ : ( **إن اللّه عز وجل خلق آدم عليه السلام ثم مسح ظهره بيمينه فاستخرج منه ذرية، فقال: خلقت هؤلاء للجنة وبعمل أهل الجنة يعملون**

رسول اللّه ﷺ فەرمووی اللّه عزوجل کاتێ ئادەم ـی دروست کرد بەدەستی ڕاستی خۆی دەستی بە پشت ئادەم هێنا نەوەکانی ئادەم ـی لەپشت ئادەم دەرهێنا پاشان اللّه فەرمووی ئەمانەم بۆ بەهەشت دروست کردووە وە بەکرداری بەهەشتیەکان کردار ئەکەن

**ثم مسح ظهره فاستخرج منه ذرية فقال: خلقت هؤلاء للنار، وبعمل أهل النار يعملون،**

پاشان دەستێ تری بەپشت ئادەم هێنا نەوەکانی لەپشت ئادەم دەرهێنا فەرمووی ئەمانەشم بۆ دۆزەخ دروست کردووە وە بەکرداری دۆزەخیەکان کارەکەن

فقال رجل: **يا رسول الله، ففيم العمل؟** فقال رسول الله ﷺ : **إن الله عز وجل إذا خلق العبد للجنة استعمله بعمل أهل الجنة حتى يموت على عمل من أعمال أهل الجنة فيدخله به الجنة،**

پیاوێک وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ ئیتر ئێمە بۆکردار بکەین ؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی الله عز وجل هەر بەندەیەکی دروستکردبێت بۆ بەهەشت ئەوا بەکاری ئەهێنێت بەکردارکردن بەکرداری بەهەشتیەکان تا لەسەر کردارێکی بەهەشتیەکان ئەمرێت وئەچێتە بەهەشتەوە

**وإذا خلق العبد للنار استعمله بعمل أهل النار حتى يموت على عمل من أعمال أهل النار فيدخله النار** ).

وەئەگەر بەندەیەکیشی بۆ دۆزەخ دروستکردبێت ئەوا بەکاری ئەهێنێت بۆکردار کردن بەکرداری دۆزەخیەکان تا لەسەر کردارێکی دۆزەخیەکان ئەمرێت وئەچێتە دۆزەخەوە .

کەواتا کاتێ کەسێ لەسەر کرداری ئیمان ئەمرێ وکرداری چاک ئەکات ئەوا الله وای بۆ نووسیوە وە الله ویستی لەسەر بووە ئەو کارە بکات تا بیخاتە بەهەشتەوە ، وە کەسێکیش لەسەر خراپە وکوفر بمرێت ئەوا الله وای بۆنوسیوە ویستویەتی بیخاتە دۆزەخەوە .

## ویستی اللّه تعالی لە بابەتی قەدەر جیاوازە لە ویستی شەرع ـی

واتا لە قەدەردا مروٚڤ ومخلوقات هیچ شتێکیان پێ ناکرێ ئەبێت سەرەتا اللّه ویستی لەسەر کردنی ئەوشتە بێت پاشان اللّه ئەو ویستە ئەخاتە دڵی بەندەکانەوە تا ئەنجام ـی بەن

بەڵام لە شەرعدا اللّه تعالی ویستی ڕازی بوونی لەسەر ئەوە نییە بەندەکانی تاوان وسەرپێچی وکوفر ئەنجام بەن بەڵام ویستی قەدەر جیاوازە اللّه خوٚی بیەوێ هەر کەسێ بچێتە دوٚزەخەوە چاوی کوێر ئەکات لە ئاست هەق کوفر وئیلحاد ئەخاتە دڵیەوە تابیخاتە دوٚزەخەوە وە اللّه خوٚی ڕقی لەکوفرە بوٚیەش ئەیخاتە دوٚزەخەوە

عبد اللّه بن الحارث بن نوفل ئەفەرمووێت :

**خطبنا عمر بن الخطاب رضي اللّه عنه بالجابية -يعني: في الشام- فحمد اللّه وأثنى عليه، فلما أتى على قوله: من يهده اللّه فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له**

ئیمام ـی عمر لەشام وتاری بوٚیاین سوپاس وستایشی اللّه ـی کرد وپاشان کەگەشتە خوێندنەوەی (هەرکەسێ اللّه هیدایەت ـی بات گومڕا نابێت وهەرکەسێکیش اللّه گومڕای کات هیدایەت ـدراوی بوٚنیە )

جاثلیق گەورەی گاورەکان وتی

برکست برکست.

ئیمام عمر فەرمووی : **ما يقول عدو اللّه ؟ قالوا : يا أمير المؤمنين يزعم أن اللّه عز وجل يهدي ولا يضل**

وتی ئەو دوژمنەی اللّه ئەڵێت چی؟

وتیان ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەڵێت اللّە نەهیدایەت کەس ئەیات نەکەسیش گومڕا ئەکات

ئیمام عمر فەرمووی : **كذبت يا عدو اللّه! بل اللّه عز وجل خلقك، وهو أضلك، وهو يدخلك النار إن شاء اللّه واللّه لو لا لوث عهد لك - أي : لو لا عهد بينا وبينك - لضربت عنقك**

درۆت کـرد ئەی دووژمن ـی اللّە بەڵکو اللّە دروستی کردوی وەگومڕات ئەکات وەئەشتخاتە دۆزەخەوە ئەگەر ویستی لێ بێت وەئەگەر پەیمان لەنێوانمان نەبایە لەگەردنم ئەیایت .        ( الابانه من اصول الديانه )

**دروست نیە هەرکەسـێ تاوان بکات بیشەرعێنێت بەوەی بیداتە پاڵ قەدەرەوە** ئەگەر چی تاوانەکە بەقەدەر بۆت نوسراوە بەڵام لەشەرع ـدا تاوانباریت نابێت بێ تاوانی خۆت بەبیانوی قەدەر دەرببڕی .

بەڵام خودی تاوانەکە بە قەدەر لەسەرت نوسراوە

رسول اللّە ﷺ ـدەفەرمووێت :

**ئادەم و موسا قسەیان کرد موسـا فەرمووی ئەی ئادەم تۆ باوکـی ئێمـەی بوی بەهۆکاری دەرکردنمان لەبەهەشت**

ئادەم فەرمووی : **أنت موسى اصطفاك اللّە بكلامه، وخط لك التوراة بيده، أتلومني على أمر قدره اللّه علي قبل أن يخلقني بأربعين سنة ؟**

تۆ موسـای کە اللە هەڵی بژاردووی بەکەلام ـی خۆی وە تەوراتی بەدەستی خۆی بۆت نوسیوە ئایا لۆمەمدەکەی لەسەر کارێ کە اللە لەسەری نوسیوم پێش ئەوەی دروستم بکات بەچل ساڵ ؟

فقال النبي ﷺ : **فحج آدم موسى فحج آدم موسى فحج آدم موسى**

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەڵگەی ئادەم بردیەوە لەموسا وبەڵگەکەی ئادەم بردیەوە لەموسا . ( ئەم فەرموودەش بەیەکدەنگی سەلەف قبوڵکراو وپشت بەستراو صەحیحە )

کەواتـا تاوانەکەی ئادەم بەقەدەر نوسراوە

بەڵام بەڵگە هێناوەکەی ئادەم ـیش بە قەدەر دوای ئەوە دێت کە تەوبەی لە تاوانەکەی کرد نەکـ بەڵگە هێنانەوە بە قەدەر بکاتە هۆی ڕێگەدان بۆ خۆی بە تاوان چونکە قەدەر شتێکی شاراوەیە کەس نازانێت لەقەدەردا چی بۆ نوسراوە بۆیە نابێت خۆی هەنگاو بنێت بۆ کاری خراپە و ڕێگە بەخۆی بات بەخراپە کـردن بە بیانوی قەدەر چونکە ئەوە کاری موشریکەکان بوو شیرکەکەی خۆیان ئەشەرعاند بەبیانوی ئەوەی لە قەدەردا بۆیان نوسراوە و اللە ویستی لێیەتی شیرکـ بکەن .

قال تعالى : ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأْسَنَاۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴾ [الأَنْعَام : ١٤٨]

ئەوکەسانەی هاوەڵیان بۆ اللە دانا، بێگۆمان بۆخۆ ڕزگارکردنی خۆیان دەڵێن ئەگەر اللە ویستبای کە خۆمان وباوو باپیرانمان هاوبەشی بۆ دانەنێین، قەت هاوبەشمان بۆ دا نەدەنا و هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد ئەوانەیش لە پێشیانەوە

بوون هەر ئاوا وەکو ئەمانە باوەڕیان بەپێغەمبەران نەهێناو، کەوتنە درۆو دەلەسە هەڵبەستن و، بەدرۆیان خستنەوە هەتا سزاو تورەیی ئێمەیان بۆهات و چەشتیان پێیان بڵێ : ئەگەر بەڵگەیەکی زانستیان لایە بۆ ڕاستیی بۆچوونەکانیان بۆمانی دەربخەن ؟ دیارە ئێوە تەنها دوای گومان و سەر لێشێواوی دەکەون وە هەر لەخۆتانەوە قسەئەکەن و درۆ دەکەن، ئەگینە هیچ بەڵگەیەکتان لانیە .

<u>کە واتـا بەڵگەهێنانەوە بۆڕێگەدان بەنەفست بۆکوفر وشیرک دینی موشریکانە</u>

بە پوختی قەدەر پێکـ دێت لەم چوار پلەیە

① اللّه زانستی بەهەموو شتێکـ هەیە ئەوەی ڕوویداوە وئەوەی ڕووی نەداوە ئەوەشی ڕووبدات چۆن دەبێت وچی ئەبێت .

قال تعالى : ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ [الحشر : ٢٢]

اللّه ئەو زاتەیە هیچ پەرستراوێ نیە بەهەق جگە لە خۆی زانایە بەهەموو شتە پەنهانیەکان ودیارەکان .

② اللّه تعالى قەدەری هەمووشتێکیێ نوسیوە هەرشتێ ڕوودەدات تاقیامەت هەمووی نوسیوە .

ئیمام ـی البخاري لەعمران بن حصين رضي اللّه عنه گێڕاویەتیەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

**کان اللّه ولم یکن شيء غیره، وکان عرشه على الماء، وکتب في الذکر کل شيء، وخلق السماوات والأرض.**

اللّه تعالی هەبوو هیچ شتێ لەغەیری خۆی نەبوو وە عەرشەکەی لەسەر ئاوە وە لە لوح المحفوظ هەموو شتێکی نوسیوە وە ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد.

لە سنن الترمذي لە عبادة بن الصامت رضي اللّه عنه لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی

**إن أول ما خلق اللّه القلم فقال له : اكتب فقال : رب وماذا أكتب؟ قال: اكتب مقادير كل شيء حتى تقوم الساعة.**

یەکەم شت کە اللّه ـدروستی کرد پێنوس بوو ، بە پێنوسی فەرموو بنووسە وتی چی بنوسم پەروەردگارم ، فەرمووی قەدەری هەمووشتێ بنوسە تاهاتنی قیامەت .

هەموو شتێ نوسراوە وە تەنانەت دووعاکردن تۆ کاتێ دووعایەک ئەکەی پێش وەختە اللّه نوسیویەتی کە فلانە دووعا بکەی تا بەهۆی ئەو دووعایەوە لەنوسینی قەدەرێکی تر لات بــدات .

3 ویستی اللّه

واتـا هیچ شتێ لەئاسمانەکان وزەوی لەباشە وخراپە و مردن وژیان وچوونە بەهەشت ودۆزەخ ڕوونایات ئیلا اللّه تعالی ویستی لەسەرە کە ڕووبــدات .

اللّه ـدەفەرموویێت :

﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ [الإنسَان : ٣٠]

وە هیچ شتێک لەم شتانە ئارەزوو ناکەن، مەگەر کاتێ ویستی اللّه ـی لەسەر بێت. واتە : ئەگەر الله ویستی لێ نەبێت ئێوەش ناتوانن ویستان لەوشتە ببێت ، بەڕاستی اللّه زۆر زانایە، ئەزانێ کێ چی هەڵدەگرێ و، شایستەی چییە .

له صحيح ـی مسلم له عبد اللّه بن عمرو بن العاص رضي اللّه عنهما بیستم له رسول اللّه ﷺ ئەیفەرموو ( **إن قلوب بني آدم كلها بين إصبعين من أصابع الرحمن كقلب واحد يصرفه حيث يشاء** ) .

دڵی هەموو نەوەکـان ـی ئادەم لە نێوان دوو پەنجەیە لەپەنجەکان ـی اللّه چۆنی بوویت بەوشێوە هەڵی ئەسوڕێنێت

الله تعالی ئەفەرمویێت لەسەر زاری پێغەمبەر موسا کەموسـا فەرمووی ﴿ إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ ﴾ [الأَعْرَاف : ١٥٥]

پەروەردگارم دیارە ئەو ڕووداوە هەر تاقییکردنەوەی خۆتە بۆ هەمووومان هەرویستـی خۆتە هەر کەسێکی پێگومڕا بکەیت و، هەر کەسێکیش شارەزاو ڕێنما بکەیت.

نُوحٌ عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی : ﴿ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ [هُود : ٣٤] ،

خۆی ئەگەر اللّه بییەوێ گومڕاشتان بکاو ڕێتان لێتێک بدا، ئیتر من هەر چەند ئامۆژگارییتان بکەم بۆ سوود و کەڵکی ئێوە، سوود و کەڵکی نابێ بۆتان، چونکە اللّه خۆی دەیەوێ گومڕابن، دیارە کە ئیتر هەرگیز ناتوانن لە ئیرادەی ئەو دەرچن هەر ئەویشە پەروەردگارتان و هەر بۆلای خۆیشی دەچنەوە وحیساب و لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکات .

وقال تعالی ﴿ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً ﴾[الإِسْرَاء : ٤٦] پەردەمان بەسەر دڵیاندا کێشاوە

﴿ أَن يَفْقَهُوهُ ﴾[الإِسْرَاء : ٤٦] بۆ ئەوە لێت تێنەگەن .

وقال تعالى ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴾ [القَصَص : ٤١]

کــردمانن بە پێشەوایانێ خەڵکــی بۆ دۆزەخ بانگ بکەن وە لە قیامەتیش ڕزگارنابن .

کەواتــا هەموو شتێ بەویستی اللّه یە

لەوانەیە بپرسیت جیاوازی عەقیدەی ئەهلی سونەت وجەبریەکان چیە ؟

جەبریەکان ئەڵێن اللّه بەندەکان ناچاردەکات لەکردنی هەرکارێ باش بێت یان خراپ

بەڵام ئەهلی سونەت دەڵێن ئەو وشەی ناچارکردنە بیدعەیە

چونکــە وشەی ناچارکردن لەقورئان وسونەت نەهاتووە ، وە ناچارکردن بۆ شتێ بەکاردێت بە زۆر کارێ بەکەسێ بکەیت بەبێ ئەوەی ئەو کەسە حەزی لەکردنی ئەوکارە ببێت.

بەڵام ئەهلی سونەت ئەفەرموون اللّه تعالى بۆ هەر کارێ کەویستی لێ بێت بەندەکان ئەنجامی بەن سەرەتا حەزێ لە دڵی بەندەکان دروست ئەکات بۆ کردنی ئەوکارە جا اللّه ویستی کردنی کارەکە ئەخاتە دڵی بەندەکەیەوە بەندەکەش بەحەزی دڵی خۆی ئەنجامی دەدات واتــا بە حەزلێکردنەوە ئەنجامی دەدات چونکە اللّه ئەو حەزە ئەخاتە دڵیەوە کــە واتــا ناچاری نەکرد بەڵکو اللّه وایــلێکرد بە حەزەوە ئەو کارە ئەنجام بدات .

بۆیە ئەهلی سونەت لەبڕی وشەی (جەبر) ناچارکردن وشەی (جبل) بەکار ئەهێنن

پێغەمبەر ﷺ بە الاشج عبدالقیس ـی فەرمووە ( **إنَّ فيكَ خَلَّتَيْنِ يُحِبُّهُما اللّه الحِلْمُ والأناةُ** ،

دوو سیفەتی جوانت تێدایە اللّه خۆشی ئەوێت ژیری ئەقڵ و لەسەر خۆی

قال : **يا رسولَ اللّهِ ! أنا أَتَخَلَّقُ بهما أَمِ اللّهُ جَبَلَنِي عليهما ؟** قال : **بَلِ اللّهُ جبلكَ عليهما** .
قال : **الحمدُ للّهِ الذي جَبَلَنِي على خَلَّتَيْنِ يُحِبُّهما اللّهُ ورسولُه** ).

وتی ئەی پێغەمبەری اللّه ﷺ ئەم دووسیفەتە خۆڕسکیە خۆم لەخۆما دروستمکردوە یان اللّه تعالی وای ڕاهێناوم ؟ فەرمووی بەڵــکو اللّه وای ڕاهێناوی پێی بەخشیویت ، فەرمووی سوپاس بۆ ئەو اللّه یەی لەسەر دووسیفەت منی ڕاهێناوە کە خۆی وڕسولەکەی ئەو دوو سیفەتەیان خۆشەوێ .

لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە ئەهلی سونەت ئەڵێن اللّه تعالی بەندەکان ڕائەهێنێ کەبەحەزی خۆیان کردارەکە ئەنجام بەن نەکـ بەناچاری (جەبر). ( صحيح أبي داود )

و اللّه تعالی ستەم ـی نەکردووە کاتێ هەرکەسێ گومڕا ئەکات وسەر لێشواوی ئەکات بەڵــکو حیکمەت ـی اللّه لەوە دایە

ئیمام ابن قیم ئەفەرمووێت :

**فاللّه تعالى لا يُعطي ولا يمنع إلا بحكمةٍ وعدلٍ**،

اللّه تعالی کاتێ دەبەخشێ بەبەندەیەک و نابەخشێ بەبەندەیەک ئیلا بەحیکمەت و عەدلی خۆیەتی ،

**والشاكرون هم الذين يَعرفون قدرَ نعمة الهداية ويَشكرونها**،

ئەوانەی کەسوپاسی اللّه ئەکەن ئەوانە ئەندازەی ئەو نیعمەتی هیدایەتە ئەزانن بۆیە سوپاسی اللّه ئەکەن ،

**واللّهُ سبحانه لم يعدلْ عن موجب العدل والإحسان في هداية مَن هدى، وإضلال مَن أَضَلَّ، وإعطاء مَن أعطى، ومَنْع مَن منَع**،

اللّه تعالی لەعەدالەت وچاکەکاری خۆی لای نەداوە لەهیدایەتدانی کەسانی هیدایەت ـدراو و لەگومڕاکردنی کەسانی گومڕا و لەبەخشین بەوانەی اللّه پێی بەخشیون وە لە ڕێگریکردن لەوانەی پێیانی نەبەخشیوە ،

**فهو لم يَطْرُدْ عن بابه ولم يُبعدْ عن جنابه مَن يليق به التقريبُ والهدى والإكرامُ،**

چونکـە اللّه تعالی کەسێ دوورناخاتەوە لەدەرگای خۆی و لەزاتی پیرۆزی خۆی دووریناخاتەوە کەشـایستەی هیدایەت وڕێز لێنان بێت ،

**بل طرَد مَن لا يليق به إلا الطردُ والإبعاد،**

بەڵکـو اللّه تعالی ئەوانە دوورئەخاتەوە لەخۆی کەشایستەی دەرکردن و دوورخستنەوەن ،

**وحكمتُه وحمدُه تأبَى تقريبَه وإكرامَه، وجعله مِن أهله وخاصته وأوليائه؛**

بۆیە حیکمـەت ـی اللّه وسوپاسگوزاریەکی وائەخوازێ کەئەوو کەسانە شایستەنین نزیک بن لە اللّه و دووریان بخاتەوە ونەیان کات بەدۆستی خۆی . "المدارج" (1/ 147)

④ پلەی چوارەم لەقەدەر ئەوەیە ـ اللّه تعالی هەمووشتێکی دروست کردووە و بەدی هێناوە واللّه تعالی خۆی دروستکاری چاکە وخراپەیە وخۆشی چاکە وخراپەی هێناوەتەبوون

اللّه ئەفەرمووێت : ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴾ [القَمَر : ٤٩] .

ئێمە هەمووشتێکمان بەئەندازە دروست کردووە

وە ئەفەرمووێت ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ [الزُّمَر : ٦٢]

اللّه دروستکاری هەموو شتێـکە .

**لە بەرامبەر ئەهلی سونەتدا کۆمەڵانێـک هەن پێیان ئەوترێ قەدەریەکان**

کۆمەڵی یەکەم کەسانێکـ نکۆڵی لە قەدەر ئەکەن ئەڵێن اللّه تعالی نازانێت چی ڕوودەدات پێش وەختە تا ڕووداوەکە ڕوو دەدات .

لە صحیح ـی مسلم هاتووە لە ابن عمر رضي اللّه عنهما کاتێ پێی ڕاگەیەنرا خەڵکانێ هەن نکۆڵی قـەدەر ئەکەن فەرمووی ( **إذا لقيت هؤلاء فأخبرهم أني براء منهم وأنهم برآء مني، والذي يحلف به عبد اللّه بن عمر ( أي : يحلف باللّه ) لو كان لأحدهم مثل أحد ذهبا ثم أنفقه ما قبله اللّه منه حتى يؤمن بالقدر** ).

ئەگەر گەشـتی بەو کەسـانە پێیان بڵێ من لەئەوان بەریئم وئەوانیش لە من بەریئن وەپێیان بڵێ ابن عمر سوێند ئەخوات بەاللّه ئەگەر هەریەکێ لەئەوان بەئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون ببەخشێت لێی وەرناگیرێت تائیمان بەقەدەر ئەهێنێت .

عبداللّه بن أحمد بن حنبل دەفەرمووێ بیستم لە باوکم کە پرسیاری لێکرا لەبارەی قەدەرەیەکانەوە فەرمووی ( **إذا جحد العلم، إذا قال: إن اللّه عز وجل لم يكن عالمًا حتى خلق علمًا فعلِم، فجحد علم اللّه عز وجل، فهو كافر** )

ئەگەر نکۆڵی زانستی اللّه بکات وبڵێت اللّه تعالی عالم نەبوە تا علمی دروستکردووە ئینجا زانستی بەشتەکان بردووە وە نکۆڵی لەعلم ـی اللّه بکات ئەوا کافرە.

(السنة لعبداللّه بن أحمد، رقم: 835).

جۆری دووەم ـی قەدەریەکان کە بەمجوسیە ناو براون ئەڵێن اللّه تعالی کرداری بەندەکان دروست ناکات بەندەکان خۆیان کردارەکانی خۆیان دروست ئەکەن .

جۆری سێهەم جەبریەکانن : ناو نراون بەجەبریەکان چونکە پێیان وایە بەندە ناچارە لەسەر کارەکان وهیچ ویست وحەزێ بۆ بەندە نیە وە بکەری هەقیقەت ـی کارەکان اللّه تعالی یە وە اللّه بەندەکان ناچار ئەکات لەسەر کوفر یان ئیمان . (الملل والنحل للشهرستاني جـ 1 صـ 87).

وەڵام ـی ئەوەمان دایەوە لەپلەی سێهەم ـی قەدەر کە جیاوازی جەبریەکان لەگەڵ ئەهلی سونەت چییە .

---

ئیمام ـی سفیان ـی ثەوری فەرمووی

**شُعَيْبُ لَا يَنْفَعُكَ مَا كَتَبْتَ حَتَّى تَرَى الصَّلَاةَ خَلْفَ كُلِّ بَرٍّ وَفَاجِرٍ** ،

ئەی شوعەیب سودت پێ ناگەیەنێت ئەوەی بۆم نوسیوی تاوەکـ نوێژکردن بە شەرع ـی ئەبینیت لەپشت هەموو کەسێک جا ئەو کەسە باش بێت یان خـــــراپ ( ڕەدە بۆ ئەوانەی ئەڵێن نوێژ تەنها لەپشت چاکەکار دروستە ) .

شیکردنەوە لەسەر بابەت ـی نوێژەکە

شعیب ئەڵێت وتم بە سوفیان : **یا أبا عبد اللّه الصلاة کلها**؟ .

شعیب ئەڵێ وتـم بە سفیان ئایا هەموو نوێژەکـان لە پشت چاکەکار وخراپکارەوە بکەم ؟

فەرمووی: **لا ولكن صلاة الجمعة والعيدين ،صل خلف من أدركت وأما سائر ذلك فأنت مخير لا تصل إلا خلف من تثق به وتعلم أنه من أهل السنة والجماعة.**

فەرمووی نـەخێر بەڵام نوێژی جمعە و دووجەژنەکە لەپشت هەرکەسێکەوە بوو ئەنجام ـی بەڵام نوێژەکانی تـر خۆت ئـازادی لەوەی کە نوێژنەکەی لە پشت کەسێکەوە تا لێی دڵنیابیت کەئەهلی سـونە وجەماعەیە .

کە واتـا لە قسەکەی ئیمام سفیان مەبەستی ئەوە ئەگەر نەشزانی پێش نوێژ خوێن ئەهلی سونەیە حەڵاڵە نوێژی لەپشتەوەبکەی چونکە فەرمووی خۆت ئازاد وسەرپشکی گەر حەرام بوایە نەیدەفەرموو ئازادی چونکە سەرپشک بوون نییە لە حەرامــدا .

کە واتـا ئازادی لەوەی لەپشت ئەوو کەسەوە نوێژ نەکەی بڕۆی لەپشت ئەهلی سونەیەک نوێژ بــکەی ، بەڵام گەر ئەهلی سونەتت دەست نەکەوت ئەوا نوێژ لەپشتیەوە دەکەی بانەشی ناسیت چونکە واجب ـی جەماعەت تەرک ناکرێت لەبەر سونەتی نوێژکردن لەپشت ئەهلی سونەت ، ئەسـڵەن گەر نوێژ تەنها لەپشت خاوەن عەقیدەی ئەهلی سونەت جائیز بێت و عەقیدە نەناسراو نوێژی لەپشت جائیز نەبێت کە واتـا نوێژی زۆربەی سەلەف باتڵ بووە .

② الحكم بن عطية دەڵێت :

( **سألت الحسن، فقلت: رجل من الخوارج يؤمنا، أنصلي خلفه قال: نعم، قد أم الناس من هو شر منه** )

پرسیارم لەحەسن کرد وتم پیاوێ لەخەوارج پێش نوێژیمان دەکات ئایا نوێژی لەپشتەوە بــکەین ؟

فەرمووی بەڵێ خەڵکانێ پێش نوێژیان کردووە لەخەواریج خراپتر بوون .

(أصول السنة لابن أبي زمنين 211)

جائەگەر نوێژنەکەی تەنها لەپشت ئەهلی سونەت نەبێت کەواتــا نوێژی سەلەف باتڵ بوە لەپشت ئەهلی بیدەع !

③ ابن حزم رحمـه اللّه ـدەفەرمووێت :

**وما امتنع قط أحد من الصحابة رضي اللّه عنهم، ولا من خيار التابعين، من الصلاة خلف كل إمام صلى بهم؛ حتى خلف الحجاج، وحبيش بن دلجة، ونجدة الحروري...وقيل لابن عمر في ذلك، فقال : إذا قالوا : حي على الصلاة. أجبناهم، وإذا قالوا : حي على سفك الدماء... تركناهم.**

هيچ کاتێ هيچ يەکێ لەصحابە ڕەزای اللّه يان لێ بێت وە لەباشترينەکان ـی تابعين کەسيان ڕێگری نوێژيــان نەکردووە لەپشت ئەو ئيمامەی پێشنوێژيان بۆدەکات تەنانەت نوێژيــان کردوە لەپــشت حەجاج (کەحيلاف هەبوو لەتەکفيرکردن ـی ) ولەپشت حبيش بن دلجە ونجدەی حروری(خەواريج)

وە وترا بە ابن عمر لەسەر نوێژکردن لەپشتيان فەرمووی

گەر وتيان وەرن بۆ نوێژ وەڵاميان دەدەينەوە بەڵام ئەگەر بانگمان بکەن بڵێن وەرن بۆ خوێن ڕێژی ناچين بە دەميانەوە

④ ئيمام ابن قودامەی حەنبەلی رحمە اللّه لەالمغنی بەژمارە 1125 ـدەفەرمووێت :

**و إن لم يعلم حاله ولم يظهر منه ما يمنع الائتمام به ، فصلاة المأموم صحيحة . نص عليه أحمد ؛ لأن الأصل في المسلمين السلامة**

ئەگەر حاڵی ئیمامەکە نەزانراوبێت وە شـتێکی لێ دەرنەکەوتبێت کەببێتە هۆی ڕێگریکردن لە نوێژکردن لەپشتیەوە ( کوفری لێ نەبینرابێت ) ئەوا نوێژی ئەوانەی لەپشتیەوە نوێژ دەکەن دروستە ئەمەش وتەی ئیمام احمـــــــدە چونکە ئەصڵ لەموسڵمان سەلامەت بونە .

**ولو صلى خلف من يشك في إسلامه ، فصلاته صحيحة**

وە ئەگەر نوێژی کـرد لەپشت کەسێ کەگومانی هەبێت لەموسڵمان بوونی پێش نوێژکار ئەوا نوێژەکەت لەپشتیەوە درووســتە .

⑤ شــێخ ـی ئیسلام ابن تيمية دەفەرموویێت :

( **لم يقل أحد من الأئمة: إنه لا تجوز الصلاة إلا خلف من علم باطن أمره** )

هیچ یەکێ لەپێشەوایان نەیان فەرمووە نوێژکردن جائیز نییە ئیلا لەپشت کەسێکەوە نەبێت کەعەقیدەکەی بزانیت . (مجموع الفتاوى 281/3)

هەموو ئەو وتانەی سەلەف کە هاتووە ئەڵێت نوێژ مەکەن لەپشت ئەهلی سونەت نەبێت مەبەستیان ئەوە نییە نوێژ کردن لەپشت کەسێ نەیناسیت حەرامە .

بەبەڵگەی ئەم وتەیە

⑥ ابن أبي زمنين لە أصول السنة (284/1) ـدەیگێڕێتەوە :

**قَالَ اِبْنُ وَضَّاحٍ وَسَأَلْتُ يُوسُفَ بْنَ عَدِيٍّ عَنْ تَفْسِيرِ حَدِيثِ اَلنَّبِيِّ ﷺ خَلْفَ كُلِّ بَرٍّ وَفَاجِرٍ قَالَ : اَلْجُمُعَةُ خَاصَّةً، قُلْتُ : وَإِنْ كَانَ اَلْإِمَامُ صَاحِبَ بِدْعَةٍ ، قَالَ نَعَمْ، وَإِنْ كَانَ صَاحِبَ بِدْعَةٍ؛ لِأَنَّ اَلْجُمُعَةَ فِي مَكَانٍ وَاحِدٍ لَيْسَ تُوجَدُ فِي غَيْرِهِ.**

ابن وضاح دەڵێت پرسیارم لە یوسف ـی كوڕی عدی كرد لەبارەی ڕاڤەی فەرموودەی نوێژ بكە لەپشت هەموو چاكەكار وخراپكارێ ، یوسف فەرمووی نوێژی هەینی تایبەتە

وتم ئەگەر چی ئیمامەكە خاوەن بیدعەش بێت ؟

فەرمووی بــەڵێ ئەگەر خاوەن بیدعەش بێت چونكە جومعان لەیەک جێگا ئەنجام دەدرێت شوێنی تر نیە بۆی بچیت .

كەواتا بۆیە بۆ نوێژەكانی تر لەپشت مبتدعەوە نایكەن چونكە شوێنی تریان هەبووە ئەهلی سونەت پێش نوێژی كــردووە .

بەڵام چونكە جومعان لەیەک شوێن دەكرێت نوێژەكە دەكەن گەرچی ئیمامەكە مبتدع یش بێت خۆ ئەگەر نوێژكــردن دروست نەبێت لەپشــت مبتدع ئەوا جومعەش ناكرێت لەپشتیان و دەیفەرموو دووبارەی بكەوە .

كەواتــا بۆ نوێژەكانی تریش گەر ئەهلی سونەتت دەست نەكەوت ئەوا نوێژەكەت دەكەی گەرچی پێش نوێژەكە مبتدع یش بێت ، بەڵام گەر مزگەوتی ئەهلی سونەت هەبێت ئەوكاتە لەپــشت مبتدع ـەوە ناكرێت ، بەڵام بشی كەێت هەر درووستە وەک سفیان فەرمووی خۆت ئازاد وسەرپشــكی

(7) لەلای سەلەف تەنها نوێژ لە پـشت كافرەوە جائیز نییە

البربهاري رحمه الله له (شرح السنة ) 49 ـدەفەرموێت :

**والصلوات الخمس جائزة خلف من صليت إلا أن يكون جهميا فإنه معطل وإن صليت خلفه فأعد صلاتك.**

پێنج فەرزەکە جائیزە لەپـــشت هەرکەسێکەوە ئەنجامی بەیت تەنها جەهمی نەبێت چونکە ئەوانە معطلەن ئەگەر نوێژت کرد لەپشتیان دووبارەی کەوە .

کە واتـا ئەگەر لە پشت مبتدع وعەقیدە نەناسراو جائیز نەبوایە دەیفەرموو نوێژ لەپشت عەقیدە نەناسرا ومبتدع یش جائیزنیە بەڵام تەنها لەپشت مورتەد فەرمووی جائیز نییە ، کەواتا ئەگەر عەقیدەی مەلاکە نەناسـیت نوێژی لەپشتەوە ئەکرێت هەرکەس بڵێت نوێژی لەپشتەوە ناکرێت ونوێژەکە باتڵە ئەوکەسە مبتدع ـە

شـێخ ـی ئیسلام ابن تیمیة ـدەفەرمووێت :

( **لم یقل أحد من الأئمة : إنه لا تجوز الصلاة إلا خلف من علم باطن أمره** )

(مجموع الفتاوی 281/3)

هیچ یەکـێ لە پێشەوایانی دین نەیان وتوە نوێژ دروست نییە ئیلا لەپشـتی کەسێکەوە نەبێت کە عەقیدەی بزانیت .

وە فەرموویـەتی :

( **الصلاة خلف المستور جائزة باتفاق علماء المسلمین، ومن قال: إن الصلاة محرمة أو باطلة خلف من لا یعرف حاله. فقد خالف إجماع أهل السنة والجماعة** )

نوێژ لە پـشت کەسێ کە عەقیدە وحاڵی نەزانراوە دروسـتە بەیەکدەنگی زانایان ـی موسڵمان وە هەرکەسێ بـڵێت نوێژ دروست نییە یان باتڵە ئیلا لەپشت کەسێکەوە حاڵی زانراوبێت ئەوا خاوەن ئەم وتەیە پێچەوانەی ئیجماع ـی ئەهل ـی سونەت وجەماعەی کردووە . (مجموع الفتاوی 282/3)

وە دەفەرمووێت :

( **من قال: لا أصلي جمعة ولا جماعة إلا خلف من أعرف عقيدته في الباطن، فهذا مبتدع مخالف للصحابة والتابعين** )

هەرکەس بڵێ من نوێژی جمعە وجەماعە ناکەم ئیلا لەپشت کەسێکەوە نەبێت کەعەقیدەی بزانم ئەوا ئەوکەسە مبتدع ـە و پێچەوانەی هاوەڵان وتابعین ـە .

(مجموع الفتاوى 542/4)

دیسان شێخ ـی ئیسلام ابن تیمیە رحمە اللّٰە دەفەرمووێت

( **يجوز للرجل أن يصلى الصلوات الخمس والجمعة وغير ذلك خلف من لم يعلم منه بدعة ولا فسقا باتفاق الأئمة الأربعة وغيرهم من أئمة المسلمين** ،

دروستە بۆ پیاو کەپێنج فەرزەکە ونوێژی جمعە وجگە لەوەش ئەنجام بات لەپشتی کەسێکەوە کە بیدعە و فسق ـی لێ نەبینیوە بە یەکدەنگی پێشەوایانی موسڵمان

**وليس من شرط الائتمام أن يعلم المأموم اعتقاد إمامه ، ولا أن يمتحنه فيقول : ماذا تعتقد ؟ بل يصلى خلف مستور الحال** ،

وە بە مەرج نەگیراوە بۆ شەرع ـی بونی نوێژ لەپشت ئیمامێکەوە ئیلا عەقیدەی ئیمامەکە بزانیت یان برۆی پرسیاری لێ بکەی وبڵێی تۆ عەقیدەت چیە بەڵکو نوێژ لەپشت مستور حال ( واتە ئەومەلایەی عەقیدەی لەئێمە شاراوەیە ونازانین چیە )

**ولو صلى خلف من يعلم أنه فاسق أو مبتدع ففي صحة صلاته قولان مشهوران في مذهب أحمد ومالك ، ومذهبُ الشافعي وأبى حنيفة الصحة** .

بەڵام ئەگەر نوێژ بـکات لەپشتی کەسێکەوە بزانێت ئەو کەسە فاسق ـەیان مبتدع ـە ئەوا بۆ دروست ـی نوێژەکەی دوو وتەی مشهور هەیە لەمەزهەب ـی احمد ومالـک و مەزهەبی شافعی وابوحەنیفە ...

**وأما " الصلاة خلف المبتدع " فهذه المسألة فيها نزاع وتفصيل . فإذا لم تجد إماما غيره كالجمعة التي لا تقام إلا بمكان واحد وكالعيدين وكصلوات الحج خلف إمام الموسم فهذه تفعل خلف كل بر وفاجر باتفاق أهل السنة والجماعة**

بەڵام نوێژ لەپـشت مبتدع ئەمە بابەتـێ خیلافیە و تەفسیلی تێدایە ئەگەر هیچ پێشەوایەکی تر نەبوو کە جومعەی لەپشتەوە بکەی چونکە جمعە لەیەکـ شوێن ئەنجام دەدرێت وە وەکـ دوو جەژنەکە وە وەکـ نوێژ لەپشت ئیمام لەکات ـی مەوسم ئەم نوێژانە لەپشت هەموو ئیمامـێ ئەکرێ باش بـێ یان خراپ

**وإنما تدع مثل هذه الصلوات خلف الأئمة أهل البدع كالرافضة ... إذا لم يكن في القرية إلا مسجد واحد فصلاته في الجماعة خلف الفاجر خير من صلاته في بيته منفردا ؛ لئلا يفضي إلى ترك الجماعة مطلقا .**

ئەم نوێژانە ئەنجام نادرێت لەپشـت مەلای ئەهلی بیدەع ـی ڕافیزە وهاوشێوەکانیان ... ئەگەر لە لادێیەکـدا تەنها مزگەوتـێ هەبێت ئەوا نوێژی جەماعەتەکەت دروستە جامەلاکە باش بێت یان خراپ چونکە نوێژی جەماعەت کردنت لەپـشتی مەلایەخراپ باشترە لەوەی لەماڵ بەتەنها نوێژ بـکەی بۆئەوەی سەر نەکێشێت بۆ وازهێنان لەنوێژی جەماعەت بەگشـتی .

**وأما إذا أمكنه أن يصلي خلف غير المبتدع فهو أحسن وأفضل بلا ريب.**

بەڵام ئەگەر توانای هەبوو نوێژ بـکات لەپشتی کەسـێ کەمبتدع نەبێت ئەوا بـاشتر وچاکترە بـێ هیچ گومانـێ . "مجموع الفتاوى" (23/351- 356) .

بەپوختـــــتی //

① نوێژ لەپشت مەلایەکـ بزانیت کافر ومورتەدە وکەوتۆتە ڕیــدەوە باتڵە ئەگەر کردت دەبێت دووبارەی کەیتەوە.

② نازانیت مەلاکەعقیدەی چیە نازانیت کوفری هەیە یاخود نــا ئەمە بێ پرسیارکردن لەعەقیدەی نویژ ئەکەیت و دروستە.

③ مەلایــەک کوفری لێدەرنەکەوتوە بەڵام بیدعەچیە ئەمە ئەگەر بتوانیت بڕۆی لەپشت مەلایەکی ئەهلی سونەت نوێژ بکەی ئەوا دەڕۆی بۆ پشت مەلا سونیەکە لەپــشت مبتدعەکە نوێژ ناکەی بەڵام ئەگەر مەلای سونیت دەست نەکەوت یان دووربوو لێتەوە ئەوا لەپــشت مەلا مبتدع ـەکەوە نوێژ ئەکەی بەو مەرجەی بیدعەکەی کوفری نەبێت.

لێرەدا ئەهلی فیتنە وشوبهات شوبهەیە ئەوروژێنن ئەڵێن

ئیمام ـی احمد فەرمووی ( **من سەرەتا ئاسانكاریم ئەكرد لەم بابەتە، بەڵام كاتێک كە بیدعە زۆر بوو ئەوا نوێژ مەكە تەنها لەدوای ئەو كەسە نەبێت كە عەقیدەكەی ئەزانیت** ) . (طبقات الحنابلة : ١/٥٩)

ئەم وتەیــەی ئیمام ـی احمد مەبەست ـی پێی ئەوەنیە نوێژکـردن لەپــشت کەسێ عەقیدەی شاراوەیە دروست نیە بـەڵکــو مەبەستی ئەوەیە لای ئیمام احمد باشتر وایە نوێژ نەکەیت ئیلا لەپشت کەسێکەوە کەبزانیت ئەهلی ســونەیە ئەمما ئەگەر ئەهلی ســونەتت دەست نەکەوت نوێژکردنت لەپشت کەســێ کەعەقیدەی شاراوەیە دروســتە .

بەڵگــەش وتەی ئیمام ـی ئەحمـەدە رحمە اللّە

عبد اللّە ـی کوڕی ئیمام أحمد ـدەفەرموویێت ( **إذا كان الذي يصلي بنا لا يقول بشئ من هذا صليت خلفه فإذا كان يصلي بنا يقول بشئ من هذا القول أعدت الصلاة خلفه**)

( كتاب حكم الصلاة خلف المبتدع والفاسق ) .

ئەگەر ئەوکەسـەی پێش نوێژیمان بۆ دەکـات ئەوقسانە ناڵێت ( وتەی قورئان مەخلوقە ) ئەوا نوێژی لەپشتەوە دەکەم جا ئەگەر پێش نوێژی بۆکـردین و ئەوقسانەی دەکرد ( واتە کوفری دەرخست ) ئەوا نوێژەکە دووبارە ئەکەمەوە .

کەواتە لەعەقیدەی ئیمام احمد مەلایەکـ کوفری لێ نەبینرابێت نوێژی لەپشت ئەکرێ ئەگەر چی زۆربەی مەلاکانی تریش لەکوفردا بن بەبەڵگەی ئەوە وتەیە کەئێستا خوێندتەوە.

ئەی مەبـەست ـی ئیمام احمد چیە کەفەرمووی من سەرەتا ئاسانکاریم دەکرد لەبابەتی نوێژکـردن ؟؟

① مەبـەستی ئیمام احمد ئەوەیە سەرەتـا تەکـفیری جەهمیەکان ـی نەدەکـرد کەواتە نوێژی لەپشتیان بەدروست زانیوە پێش تەکفیرکردنیان (بەو واتایەی بیدعەکەیان ـی بەبیدعەی کافرکەر نەدەزانـــی ) .

وەکـ پرسیاری لێدەکەن خۆی دەفەرموویێت

ابراهیم الدورق ـی دەفەرمووێت

( **سألت أحمد بن حنبل عمن يقول : القرآن مخلوق ؟ فقال : كنت لا أكفرهم حتى قرأت آيات من القرآن : وَ لَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْواءَهُمْ مِنْ بَعْدِ ما جاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ و قوله: بَعْدَ الَّذِي**

**جاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ و قوله : أَنْزَلَهُ بِعِلْمِهِ فالقرآن من علم اللّهّ و من زعم أن علم اللّهّ مخلوق فهو كافر )**

پرسیارم لە ئەحـمەدی کوڕی حەنبەل کرد لەبارەی کەسێک کەبڵێت قورئان مەخلوقە

ئیمام فەرمووی

من سەرەتا تەکـفیرم نەدەکـرن تا چەند ئایەتێکم خوێندەوە لە قورئان اللّە ـدەفەرموویت ( **ئەگەر شوێن هەواو ئارەزووی ئەوان بـکەویت لەپاش ئەوەی زانستت بۆ هاتووە** ) وە اللّە ـدەفەرموویت ( **اللّە بەزانست ـی خۆی دایبەزاندووە** ) قورئان لەزانستی اللّە یە هەرکەس پێی وابێ زانستی اللّە مەخلوقە ئەوە کـافرە .

② جاکـە ئیمام احمد سەرەتـا جەهمیەکان ـی پێ کافرنەبـوە وبیدعەکەیان ـی بەکوفری نەزانی بـــوو .

لەهەمان کاتدا ڕێگەی ئەیا لەپشت مبتدعەوە نوێژ بـکرێت یەکێ لەو مبتدعانەی سەردەم ـی ئیمام جەهمیەکان بـوو کەپرسیاریان لەئیمام احمد کرد لەبارەی نوێژ لەپشت مبتدعەوە

( **أيصلى خلف صاحب بدعة ؟ فقال : إذا كان داعية أو يخاصم فيها أو يدعو إليها لا يصلى خلفه ولا يكلم. فقلت: فمن كان فيه شيء إلا أنه لا يخاصم فيه؟ قال: هو أهون. قلت: فيصلى خلف هذا؟ قال نعم. قلت: أ فليس هذا صاحب بدعة؟ قال: بلى ولكن هذا لعله لا يدرى يرجع، وهذا يدعو إليها** )

ئایا نوێژ لەپشت خاوەن بیدعەوە دەکـرێ ؟ فەرمووی ئەگەر بانگەوازکار بێت و مناقەشەی لەسەر بـکات وبانگەوازی بۆبکات نوێژی لەپشتەوە ناکرێ وقسەی لەگەڵ ناکرێ ، وتم ئەی ئەگـەر بیدعەی هەبێت و مناقەشە لەپێناو بیدعەکەی نەکـات؟

ئیمام احمد فەرمووی ئەمە ئاسانترە

وتم نوێژی لەپـشتەوە ئەكرێ ؟

فەرمووی بەڵــێ

وتم ئەی ئەم كەسە مەگەر خاوەن بیدعە نیە ؟

فەرمووی بەڵێ بەڵام لەوانەیە ئەم كەسە جاهل بێت و بگەڕێتەوە بەڵام بانگخوازی بیدعە دەعوە دەكات بۆبیدعەكەی . (مسائل ابن هانئ ١/ ٦٢)

كەواتــا ئاسانكاریەكەی ئیمام احمد ئەوەبوو

بەشەرع ـی دەزانی نوێژ لەپشت مبتدع ـەوە بكرێت یەكێ لەو مبتدعانە جەهمیەكان بون كەئیمام سەرەتا بەكافری نەدەزانین ئەمە ئاسانكاریەكەی بــوو ، بەڵام بۆ ئەهلی بیدەع كەبیدەع ـی كوفریان لێ نەبینراو ئیمام ـی احمد فەرمووی وەكـ لەكتاب السنة هاتووە ( **ولا أحب الصلاة خلف أهل البدع** ) واتا نوێژكردن لەپشت ئەهلی بیدەعم پێ خۆش نیە .

كەواتــا ئیمام احمد نوێژكردن لەپشت كەسێ عەقیدەی نەزانراوە بەدروست ئەزانێ وەكـ ئەو وتەیەی لەسەرەتا داماناوە بەڵام وای پێخۆشترە لەپشت ئەهلی سونەت بكرێت.

كەواتـا سەرەتا ئاسانكاری كردوە نوێژی لەپشت مبتدع پێ جائیز بووە ، بەڵام دواتر پێی باش نەبوە لەپشت مبتدع نوێژ بكرێ ئیلا ئەهلی سونەت نەبێت وە لەكاتـی نەبونی ئیمامێ عەقیدەی ئەهلی سونەت بێت نوێژكردن ـی لەپشت مەلایەكەوە پێ جائیزبوە كەكوفری نەبێت وەكـ ئەو وتەیەی كەفەرمووی (ئەگەر ئەوكەسـەی پێش نوێژیمان بۆ دەكـات ئەوقسانە ناڵێت (وتەی قورئان مەخلوقە) ئەوا نوێژی لەپشتەوە

دەکەم جا ئەگەر پێش نوێژی بۆکـردین و ئەوقسانەی دەکرد(واتە کوفری دەرخست) ئەوا نوێژەکە دووبارە ئەکەمەوە ).

شێخ ـی ئیسلام ابن تیمیە ـدەفەرمووێت :

( **وكان بعض الناس إذا كثرت الأهواء يحب أن لا يصلي إلا خلف من يعرفه على سبيل الاستحباب كما نقل ذلك عن أحمد أنه ذكر ذلك لمن سأله ولم يقل أحمد ؛ إنه لا تصح إلا خلف من أعرف حاله** )

هەنێ لـەخەڵکـان کاتێ بیدعە بەربڵاوبێت پێیان خۆشە نوێژ نەکرێ ئیلا لەپشت کەسێکەوە نەبێت کەعەقیدەی بـزانن ئەم کارەشیان پێ خۆش و پێ باشە هەروەکـ لەئیمام ـی احمدەوە گێڕاوەتەوە کە کاتێ پرسیاری لێدەکەن وادەفەرموێ بـەڵام ئیمام احمد نەیفەرموو نوێژ دروست نییە ئیلا لەپشت کەسێکەوە کەحاڵــی بزانیت .

( مجموع الفتاوى (280/3) )

---

**ئیمام ـی سوفیان ـی ثەوری بەشوعەیب ئەفەرمووێت :**

**( وَالْجِهَادَ مَاضِيًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَالصَّبْرَ تَحْتَ لِوَاءِ السُّلْطَانِ جَارَ أَمْ عَدَلَ )**

**جیهاد بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت وە ئارامبگرە لەژێر دەسەڵاتداری (موسڵمان ) دەسەڵاتدارێکی ستەمکاربێت یان دادپەروەربێت .**

**بەردەوام بوونی جەنگ وجیهاد تا ڕۆژی قیامەت بنەمایەکە لە بنەماکانی عەقیدەی ئەهلی سونەت وجەماعەت بەپێچەوانەی مورجیئەکان ورافیزەکان وهاوشێوەکانیان کەپێیان وایە جیهاد ناکرێت تا محمدی مهدی دێت .**

**أبو داود لە سننەکەیـــــدا بەژمارە(2532) ڕیوایەتی کردوە لە أنس بن مالك کە پێغەمـــبەر ﷺ فەرموویـــەتی :**

**( والجهاد ماض منذ بعثني الله إلى أن يقاتل آخر أمتي الدجال )**

**تێکوشان بەردەوامە لەوکاتەی اللە منی ناردوە تاکۆتا کەس لەئومەتەکەم دەجال دەکوژێت .**

**تێـــکۆشــــان ـی بەکوشتنی دەجــال کۆتای پێ هێنا کەواتا مەبەست لە تێکۆشــان قـــتال کردنــە .**

**وە رسول اللە ﷺ فەرموویـــەتی :**

**( لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين على من ناوأهم حتى يقاتل آخرهم المسيح الدجال ) .**

**بەبەردەوام کۆمەڵێك لەئومەتەکەم کوشتار دەکەن لەسەر هەق وەدیارن بەسەر دوژمنەکانیان تاکو کۆتا کەسیان دەجال دەکوژێت .**

نەیفەرموو کۆمەڵێ لەئومەتەکەم لەکاتی دەرچونی مهدی قـــتال دەکەن نەخێر قـــتال بەردەوامە تا یەکلابونەوەی جەنگەکان لەبەرژەوەندی ئیسلام ، پاشــــان لەکام ئایەت وفەرمووده هاتوە دانیشیت جیهاد نەکەی تـــا محمدی مهدی بێت ؟؟ ئەی ئەگەر مردی پێش دەرچونی مەهدی ؟؟؟

شێخ عبد الرحمن بن حسن ال الشیّخ ـدەفەرموویّت :

**بأي كتاب أم بأي حجة أن الجهاد لا يجب إلا مع إمام متبع ؟**

**هذا من الفرية في الدين والعدول عن سبيل المؤمنين والأدلة على بطلان هذا القول أشهر من أن تذكر من ذلك عموم الأمر بالجهاد والترغيب فيه والوعيد في تركه**

بەچی کتابێك وبەچی بەڵگەیەك جیهاد واجب ناکرێت ئیلا لەگەڵ ئیمامێکی پێشەوا نەبێت ؟ ئەمە درۆکردنە بەناوی دینەوە ، وە لادانە لەڕێبازی بـــــاوەڕداران وە بەڵگەش لەسەر پوچەڵی ئەو وتەیە زۆر زیاترە لەوەی باس بکرێت لەو بەڵگانەش کەئەو وتـــەیە پوچەڵ دەکاتــــەوە گشـــتگیری فەرمانکردنە بەجیهاد و موژدە بەخشە بۆبکەرانی وهەڕەشەکـــردنە لەوانەی وازئەهێنن لە جیهاد .

( الدرر السنية 97/7 )

وە هەر کەسێک لەموسڵمانان دەسەڵاتی گرتە دەست ئەوا جیهاد لەپشتیەوە دژی دووژمنانی اللّه ئەنجام ئەدرێت جائەو دەسەڵاتدارە کەسێکی باش بێت یان خراپکاربێت .

شيخ الإسلام الشيخ محمد بن عبد الوهاب - رحمه اللّه تعالى – فەرموویەتی :

( **الأئمة مجمعون من كل مذهب على أنّ من تغلَّب على بلد أو بلدان، له حكم الإمام في جميع الأشياء، ولولا هذا ما استقامت الدنيا، لأن الناس من زمن طويل، قبل الإمام أحمد إلى يومنا هذا، ما اجتمعوا على أمام واحد** )

زانایان کۆدەنگن لەهەموو مەزهەبەکان کەفەرمویانە هەرکەسێ دەست بگرێت بەسەر شارێ یان چەند شارێ ئەوا حوکمی ئیمامی هەیە لەهەموو شتێکدا ئەگەر ئاوا نەبوایە ئەوا دونیا جێگیر نەدەبوو چونکە خەڵکی لەپێش ئیمامی ئەحمەدەوە تائەمرۆ لەسەر ئیمامێک ( ئەمیرێک ) کۆنەبونەتەوە .

("الدرر السنية في الأجوبة النجدية" (7/ 239))

جا هەر ئەمیرێ یان ئیمامێکـ کە موسڵمان بێت ئەوا لەپشتیەوە جیهادئەکرێت دژی دوژمنانی اللّه جاخراپکاربێ یان دادپەروەر وباش بێت .

ئیمامی احمد رحمه اللّه فەرموویەتی :

( **والغزو ماض مع الإمام إلى يوم القيامة البر والفاجر لا يترك** )

جەنگ بەردەوام لەپشت ئیمامەوە دەکرێت تا ڕۆژی قیامەت جائیمام چاکەکاربێت (دادوەر و ئەهلی سونەت بێت ) یان خراپەکار ( ستەمکار ومبتدع بەڵام بیدعە وستەمێ کەلەئیسلامی دەری نەکردبێت ) نابێت واز لەجیهاد بهێنرێت . (أصول السنة)

ئیمامی الآجري فەرموویەتی :

( **من أُمِّر عليك من عربي أو غيره، أسود أو أبيض، أو أعجمي، فأطعه فيما ليس للّه عَزَّ وَجَلَّ فيه معصية، وإن ظلمك حقًّا لك، وإن ضربكَ ظلمًا، وانتهكَ عرضك وأخذ مالك،**

**فلا يَحملك ذَلِكَ عَلَى أنه يَخرج عليه سيفك حتَّى تقاتله، ولا تَخرج مع خارجي حتَّى تقاتله، ولا تُحرِّض غيرك عَلَى الخروج عليه، ولكن اصبر عليه )**

هەر کەسێ فەرمانی پێ کردی ( لەئەمیری موسڵمانان ) عەرەبی یان جگە لە عەرەبی ڕەش بێت یان سپی ئەوا گوێڕایەڵی بکە لەوکارەدا کەسەرپێچی خوای تێدانیە ئەگەر چی ئەو کاربەدەستە ستەمت لێ بکات بەڕاستی ئەگەر لێی دای ئەگەر ئابڕووی بردی ئەگەر ماڵەکەی بردی هیچ یەکێ لەمانە وات لێ نەکات بەشمشێرەوە لەدژی دەربچیت وەنەکەی لەگەڵ خەوارج دەربچیت بۆشەڕکردن لەدژی وەکەس هان نەدەی بۆ دەرچوون ( لەکاربەدەستـی موسڵمان ) .   ("الشريعة (ص40))

ئیمامی بەربەهاری رحمه اللّه دەفەرمووێت : ( **لا يحل لأحد أن يبيت ليلة ولا يرى أن ليس عليه إمام برا كان أو فاجرا والحج والغزو مع الإمام ماض** ) .

حەڵاڵ نیە بۆهیچ کەسێ یەک شەو بخەوێت و باوەڕی وابێت هیچ ئیمام وسەرکردەیەکی باش یان خراپی نیە وە حەج وجیهاد لەپشت ئیمامەوە بەبەردەوامی دەکرێت .      ( السنه )

هەر بۆیەش ئیمامی سوفیانی الثوری –رحمه اللّه- بە شوعەیبی فەرموو :

ئەی شوعەیب ئەوەی بۆتم نوسیوە سودت پێ ناگەیەنێ تاباوەڕت بەوەنەبێت کە نوێژ و وجیهاد لەپشت هەموو چاکەکار وخراپەکاری ئەکرێ وەجیهاد تاڕۆژی قیامەت بەردەوامە وە ئارامگربە لەژێر ئاڵای دەسەڵاتدار جاستەمکاربێت یان دادوەربێت .

وەهەرووەهـا ئیمـامـی أبو إسماعيل الصابوني رحمه اللّه تعالى فەرموویەتـی :

**ويرى أصحاب الحديث الجمعة والعيدين، وغيرهما من الصلوات خلف كل إمام مسلم برا كان أو فاجرا. ويرون جهاد الكفرة معهم وإن كانوا جورة فجرة،**

ئەهلی حەدیث باوەڕیان وایە نوێژی هەینی ودووجەژنەکە و نوێژەکانی تر لەپشت هەموو ئیمامێ ئەنجام دەدرێت چاکەکاربیت یان خراپەکار وە باوەڕیان وایە جیهاد لەدژی کــافران لەپشت کاربەدەستانەوە دەکرێت ئەگەر ستەمکــار وخراپەکاریش بن

( عقيدة السلف أصحاب الحديث (ص92،93))

ابن قدامة حەنبەلی رحمه اللّه فەرموویەتی :

( **ونرى الحجّ والجهاد ماضيان مع كلّ إمام ، برّا كان أو فاجرا ، وصلاة الجمعة خلفهم جائزة** ) .

حەج وجیهاد بەردەوام ئەنجام دەدرێت لەپشت هەموو ئیمامێ باش بێت یان خراپەکاربێت وەنوێژی هەینی لەپشتیانەوە دروستە .     ( لمعة الإعتقاد )

شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه اللّه فەرموویەتی :

( **ويرون إقامة الحج والجهاد والجمعة والأعياد مع الأمراء أبرارا كانوا أو فجارا** )

ئەهلی سونەت حەج وجیهاد و هەینی وجەژەکان لەگەڵ کاربەدەستان ئەنجام دەدەن جاچاکەکاربن یان خراپەکاربن .            (في الواسطية ص129)

کەواتــا جیهاد بەردەوامــە وە لەپشت هەرسەرکردەیەکـ کەموســڵمان بێت جائەوسەرکردە ستەمکاربێت یان دادپەروەربێت .

وە ئەهلی ســونەت گوێڕایەڵی سەرکردە ئەکەن لەچاکەدا تائەوکاتەی سەرکردە کوفری لێ دەرنەکەوێت بەپێچەوانەی خەواریجەکان کە هەرکات سەرکردە تاوانێک یان موخالەفەیەکـی شەرع بکات لێی دەردەچن و دژایەتی سەرکردەی موسڵمان دەکەن .

أمِّ الحصين رضي اللّه عنها ـدەفەرموویٚت :

بيستم لە رسولَ اللّه ﷺ ـدەيغەرموو

( **إنْ أُمّر عليكم عبدٌ مُجدَّعٌ يقودكم بكتاب اللّه تعالى، فاسمعوا له وأطيعوا** )

( أخرجه مسلم (١٢٩٨)) .

ئەگەر بەندەیەکی دەست وپێ بڕاویش بێت بەڵام بەکـــــتابی اللّه دەتان بات بەڕێوە ئەوا ببیستن وگوێڕایەڵی بکەن .

أميرُ المؤمنين علي رضي اللّه عنه ـدەفەرموویٚت :

( **حقٌّ على الإمام أن يحكم بما أنزل اللّه عز وجل، وأنْ يؤدِّي الأمانة، فإذا فعل ذلك فحقٌّ على الناس أن يسمعوا له وأن يطيعوا، وأن يجيبوا إذا دُعوا** ) [ أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف (٣٢٥٣٢)، وسعيد بن منصور في التفسير (٦٥١)، والطبري في تفسيره (١٦٩/٧)، والخلال في السنة (٥١) ]

مافـــە لەسەر ئیمام کە حوکم بـــکات بەوەی اللّه دایبەزاندووە وە ئەمانەت بگێڕێتەوە جاگەر ئەمەی کرد ئەوە مافە لەسەر خەڵکی ببیستن وگوێڕایەڵی بکــــەن وە گەر داوایەکی کرد ووەڵامی بەنەوە .

الإمام مالك رحمه اللّه ـدەفەرموویٚت :

( **لا يكون أحدٌ إمامًا أبدًا إلا على هذا الشرط** )

( الصواعق المحرقة، لابن حجر الهيتمي (٣٧/١) )

هیچ کەسێ هەرگیز نابێت بەپێشەوایەکی شەرعی تا ئەم مەرجەی تێدا بەدی نەیەت.

ئیمام القاضي عياض ـدەفەرموویت :

( **وفيه ما يلزم مِن طاعة الأئمة إذا كانوا متمسِّكين بالإسلام، والدعوة لكتاب اللّه** )

(إكمال المعلم بفوائد مسلم (٣٧٥/٤)).

ئەم فەرموودە ئەوەی تێدایە کە کاتێ گوێڕایەڵی سەرکردە ئەکرێت کەدەستگــرتوو بێت بەئیسلام و بانگەواز بۆ کتابی اللّه بکات .

ابـن حزم رحمـه اللّه ـدەفەرموویت :

( **الإمام الواجب طاعته ما قادنا بكتاب اللّه تعالى وبسنة رسول اللّه ﷺ الذي أَمر الكتابُ باتباعها، فإن زاغ عن شيء منهما مُنع مِن ذلك**.. )

[الفصل في الملل والأهواء والنحل، لابن حزم (٤/ ٨٤)].

گوێڕایەڵی سەرکردە واجبە تائەوکاتەی بەکتابی اللّه وسونەتی رسول اللّه ﷺ بمان بات بارێوە چونکە قورئان فەرمانی کردووە بەشوێنکەوتنی جائەگەر لەشتێکی قورئان وسونەت لابات ئەوا ڕێگری ئەکرێت لەگوێڕایەڵی کردنی .

پێشەوا الأمير الصنعاني ـدەفەرموویت :

( **ولكنْ شرَطَ السمعَ له والطاعةَ بقوله : (ما أقام فيكم كتاب اللّه) أي : ما عمل فيكم بالقرآن** ) [التحبير لإيضاح معاني التيسير، للصنعاني (٧٣١/٣)].

مەرجی بیستن وگوێڕایەڵی بۆسەرکردە ئەوەیە کەپێغەمبەر ﷺ فەرمووی ( تا ئەوکاتەی کتابی اللّه لەناوتدا جێ بەجێ بکات ) واتا کار بە قورئان بکات.

ئیمام أبو عبد اللّه القرطبي ـدەفەرموویێت :

( **إذا انعقدت الإمامةُ.. وجب على الناس كافةً مبايعتُه على السمع والطاعة، وإقامةِ كتاب اللّه وسنّةِ رسوله ﷺ** ) [الجامع لأحكام القرآن (٢٧٢/١)].

گەر ئیمام (سەركردەی دەوڵەتی ئیسـ..ـلامی دانرا) واجبە لەسەر خەڵك بەگشتی بەیعەتی بەنێ لەسەر بیستن وگوێڕایەڵیكردنی و جێ بەجێكردنی كتاب ـی اللّه و سونەتی رسول اللّه ﷺ .

ئیمـــام ابن حجر رحمـه اللّه ـدەفەرموویێت :

( **والأصلُ في مبايعة الإمام أن يبايعَه على أن يعملَ بالحقّ، ويقيمَ الحدود، ويأمر بالمعروف، وينهى عن المنكر** ) ( فتح الباري، لابن حجر (٢٠٣/١٣)).

ئەصڵ لە بەیعەت ـدان بەسەركردە بریتیە لەبەیعەتدان لەسەر ئەوەی سەركردە كاربەهەق بكات و حدودە شەرعیەكان جێ بەجێ بكات وفەرمان بەچاكە بكات ونەهی لەخراپە بكات .

گەر سەركردەی موسڵمان كە پەیڕەو بە شەرعی اللّه دەكات تاوانی ئەنجام ـدا یان فەرمانی بەتاوان كرد گوێڕایەڵی ناكرێ .

عبد اللّه بن عمر رضي اللّه عنهما، لەپێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی :

( **السمعُ والطاعةُ على المرء المسلم فيما أحبّ وكره، ما لم يؤمر بمعصية، فإذا أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة** ) ( أخرجه البخاري (٦٣/٩ برقم: ٧١٤٤)، ومسلم (١٨٣٩)).

بیستن وگوێڕایەڵی واجبە لەسەر مووسڵمان لەوەی پێی خۆشە ولەوەشی پێی ناخۆشە تائەوكاتەی فەرمانی پێنەكرێت بەتاوانكردن گەرفەرمانی پێكرا بەكردنی تاوان نە ئەبیستێ نەگوێڕایەڵی ئەبێت .

علي رضي اللّه عنه لە رسول اللّه ﷺ ـدەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی :

( **لا طاعةَ في معصية اللّه، إنما الطاعة في المعروف** )

گوێڕایەڵی هیچ کەسێ ناکرێت لەسەرپێچیکردنی اللّه بەڵکو گوێڕایەڵی لەچاکەدا دەکرێت . ( أخرجه البخاري (٧٢٥٧)، ومسلم (١٨٤٠))

أبو العباس القرطبي ـدەفەرمووێت :

( **فإنْ أمر بمعصية فلا تجوز طاعته في تلك المعصية قولًا واحدًا** )

گەر سەرکردە فەرمانیکرد بەکردنی تاوان بەهیچ جۆرێ نابێت گوێڕایەڵی بکرێت ئەمە وتەی هەموو موسڵمانانە . ( المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم (٤/ ٣٨)).

کەواتـا لێرەدا بەپێچەوانەی خەوارج ـین چونکە خەوارج بەتاوان وستەم تەکفیر وخرٍوج لەحاکمی شەرعی ئەکەن ئەگەرچی حاکم دەستورەکەی قورئان وسونەتیش بێت .

لەهەمان کاتدا مورٍجیئەکان بە بینینی کوفر لەحاکم وەک حکم بەغیری ما انزل اللّه و وازهێنان لە نوێژ حاکم بەموسڵمان ئەزانن و خرٍوج ـی لێ کردنی بەحەرام وبیدعە ئەزانن .

ئەهلی سونەت مام ناوەندن

دەڵێن گەر حاکم فەرمان بکات بەکوفر وەک حوکم بەغیری ما انزل اللّه و وازهێنان لەکارکردن بەقورئان یاخود وازهێنان لەنوێژ ئەوا خرٍوج ـی لێ ئەکرێت و تەکفیر ئەکرێت ، بەڵام ئەگەر فەرمان بکات بەشتێ کەناگات بەپلەی کوفر ئەوا لەوشتەدا گوێڕایەڵی نابین بەڵام خروج یشی لێ ناکەین چونکـە لەئەسڵدا حوکمی گەلەکەی بەشەرعی اللّه دەکات .

ابن بطال لە شرح صحیح البخاري ـدەفەرموویّت :

( **وقال الجمهور مِن الأئمة وأهل الحديث: لا يُخلع بهذه الأمور -أي بالجَور والظلم-، ولا يجب الخروج عليه؛ بل يجب وعظه وتخويفه وترك طاعته فيما يدعو إليه من معاصي اللّه** ) ( شرح صحيح البخاري، لابن بطال (٨/٢١٥)).

جمهوری زانایان وئەهلی حدیث ئەڵێن سەرکردە لەحوکم لانابرێت بەدەرکەوتنی ستەم وە واجب نیە خرٶج ـی لێ بکرێت بەڵکـو واجبە ئامۆژگاری بکرێت وبەاللّە بیترسێنن وە لەوشتەدا بەقسەی نەکرێت کەبانگەشەیە بۆ سەرپێچی اللّه تعالی .

پاشان لەکۆتایـدا ئیمام ـی سوفیان ئەفەرموویّت ( **يَا شُعَيْبُ بْنَ حَرْبٍ إِذَا وَقَفْتَ بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَسَأَلَكَ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ فَقُلْ: يَا رَبِّ حَدَّثَنِي بِهَذَا الْحَدِيثِ سُفْيَانُ بْنُ سَعِيدٍ الثَّوْرِيُّ ثُمَّ خَلِّ بَيْنِي وَبَيْنَ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ** )

ئەی شوعەیب ـی کوڕی حرب ئەگەر لەبەردەست ـی اللّه تعالی وەستای لە قیامەت پرسیاری ئەم شتانەی لێکردیت بڵێ پەروەردگارم سوفیان ـی کوڕی سعیدی ثەوری ئەمانەی پێ وتم پاشان بۆ نێوان خۆم واللّه تعالی ـی جێ بهێڵە.

